# کاروان

گۆڤارێکی رۆشنبیری مانگانەیە
ئەمینداریتی گشتی رۆشنبیری و لاوان
بەزمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا

**1**

تشرینی یەکەم / ١٩٨٢


سەرنووسەر
**محمد أمین محمد احمد**

جێگری سەرنووسەر
**حسین عارف**

دەستەی نووسەران
**حسین رەشوانی**
**دکتۆر شکریە رسول**
**زبیر بلال اسماعیل**
**جلال مدحت خۆشناو**
**ناصر یوسف**
**فیصل مصطفی**

سکرتێری نووسین
**سەردار حمید میران**

نەخشەکێش و خۆشنووس
**محمد زادە**

نەخشەساز
**جعفر بەرزنجی**


**● لەم ژمارەیەدا**

# وتەی ژمارە

## بەڵێن دەدەین «کاروان» بکەینە مەنبەرێکی سەربەست بۆ هەر قەڵەمێکی خێرخوا

خۆم بە بەختیار دەزانم لەم ژمارەیەی گوڤاری (کاروان)دا کە نووسەرانو ئەدیبانو رۆشنبیرانی کورد بەتایبەتیو کوڕوکاڵانی گەلەکەمان لە ناوچەی کوردستانی خاوەن ئۆتۆنۆمیدا چاوەڕوانی دەرچوونی بوون ، ئەم وتەیە بنووسم.

ئێمەی دەستەی نووسەرانی گوڤارەکە بەڵێن بە کوڕوکاڵانی گەلەکەمان دەدەین کە ئەم گوڤارە بکەینە مەنبەری دەنگو بیروڕای سەربەستیان ، لە پێناوی سەربەرزیو سەرفرازیی گەلی عێراقماندا بە گشتیو گەلی کوردماندا بەتایبەتیو لە وەختێکیشدا کە هێرشێکی هەوشارانە لەلایەن ئیمپریالیزمەوە ئاراستەی شۆڕشی عێراقو گەلی عێراق دەکرێ،ئەویش بەو شەڕەی کە رژێمی رەگەزپەرستی خومەینی لە ئێراندا بە سەرمانیدا سەپاندوەو بە ناوی دینەوەو گوایە بە ناوی چەوساوەکانەوە ، بە هاوکاری لە گەڵ زایۆنیزمدا ئەم دەسدرێژییە دەکات . بەڵام دوژمنانی عێراق چەندە هەوڵو تەقەلای کۆسپ خستنە سەرڕێی کاروانی پێشکەوتنو بیناکاریمان بدەن ، لە بێولەتیو بەزینو هیواپووچبوونەوە زیاتریان چنگ ناکەوێ .

دەستەی نووسەران بەڵێن بە گشت برا نووسەرو ئەدیبو هونەرمەندو رۆشنبیرەکان دەدا کە گوڤاری ( کاروان ) ببێتە دەزگایەکی هاریکاریکردنو شان بە شانەوەنان لە پێناوی گەشەپێسەندنی شیعرو چیرۆکو لێکۆڵینەوەو بابەتی فۆلکلۆریو زمانەوانیو رۆشنبیری بە گشتیو لە هەموو لایەنێکەوە( زانیاری ، مێژوو ، شوێنەواری کۆن ، ئابووری.. هتد ) ، لە ناوچەی کوردستاندا . بەم پێیە ، گوڤاری ( کاروان ) دەبێتە دەنگی سیاسیو شاعیرو ئابووریزانو چیرۆکنووسو مێژوونووسو لێکۆڵەرەوە ... هتد . واتە دەبێتە دەنگی کرێکارو جوتیارو قوتابیو هەر کەسێك کە روو لە وشەی چاپکراو دەکا .

ئێمە لە هەمان کاتدا بەڵێن بە سەرکردایەتیی شۆڕشو حیزب دەدەین کە گوڤاری ( کاروان ) بکەینە مەیدانێکی بەرینی پارێزگاریکردن لە رۆشنبیریی شۆڕشگێرو ئەدەبی مولتەزیمو شانۆی بەئامانج ، لە ژێر رۆشنایی ئامۆژگاریو بیروباوەڕەکانی فەرماندەی کاروانی شۆڕشو پاڵەوانی رزگاریخوازیی نەتەوایەتی تێکۆشەر صدام حسیندا کە دەڵێ : « ئێمە لە گەڵ ئۆتۆنۆمیو لە گەڵ ئەوپەڕی پەرەپێدانیداین » .

هەروەها ئێمە بە بۆنەی دەرچوونی ئەم ژمارەی یەکەمەی ( کاروان )ەوە ، داوا لە هەموو قەڵەمە خێرخوازەکان دەکەین کە بە گەرمەوە بەشداری لە پێشخستنی گوڤارەکەدا بکەنو بۆ خزمەتکردنی کەلەپوورو سامانی نەتەوایەتیی گەلی کوردمان لە عێراقدا ، درێغی لە بەدەسهێنانی سەرکەوتندا بۆ ئەم تاقیکردنەوەیە نەکەن .

سەرنووسەر

# بەبۆنەی تێپەڕبوونی دوو ساڵەوە بەسەر جەنگی ڕەوامانداا


محمد محي‌الدين محمد

● محمد محي‌الدين محمد

جێگری ئەمینداری گشتی ڕۆشنبیری‌و لاوان


ڕۆژی چواری ئەیلوولی ئەمساڵ دوو ساڵی تەواو تێپەر بوو بەسەر شەڕی ڕەواماندا دژی ڕژێمی ئێرانیی ڕەگەز پەرست ، ئاشکرایە لای هەموو نیشتمان پەروەرێك ، بەلکوو لای هەموو دانیشتوانی جیهان کەوا خومەینیی ڕەگەز پەرست دوای دزینی شۆرشی گەلانی ئێران لە سەرەتای ساڵی « ۱۹۷۹ »ەوە دەستی دایە چەوساندنەوەی گەلانی ئێران‌و قەلاچۆکردنی گەلی کوردو عەرەب‌و لێدانی هێزە نیشتمانیەکانی ئێرانی، پاشانیش پەلامار دانی شارەکانی سەر سنووری عێراق ، لەوانە بومبا باران کردنی شاری خانەقین‌و مەندەلی‌و زەرباطیەو گوێ نەدان بەهیچ عورفێکی دەولی عێراقیش دوای ئەوەی هیچ دەرفەتێکی تری نەما بۆ ڕاگرتنی پەلاماردانە چەکداریەکانی ڕژیمی ئێرانی بۆ سەر عیراق ، ناچار بوو پارێزگاری لە خۆی بکات‌و شارەکانی سەر سنووری بپارێزێ . ئەوەبوو هێزە چەکدارەکانی عێراق دەستیان کرد بە دانانی سنوورێك بۆ ڕژێمی ئێران‌و هێزە بەزیوەکانی خومەینیان بەرەو قوولایی خاکی خۆیان ڕاو ناو پاشانیش سوپاو هێزە چەکدارەکانی عیراق بۆ پاراستنی ئاشتی لە هەرێمەکەو لەنێوان عێراق‌و ئێراندا ، کشانەوە بۆ سەر سنوورو چەند جاریش سەرەك کۆمار ، تێکۆشەر صدام حسین ئەوەی ئاشکرا کردووە کە عیراق تەماعی لەخاك‌و زەویی ئێران نیە .

بەلام سەرەڕای هەلوێستی ئاشتی خوازانەی عێراق ڕژێمی کۆنەپەرست‌و ڕەگەز پەرستی خومەینی سوورە لەسەر بەردەوام بوونی شەڕەکە بەیارمەتی دانی ئیمپریالیزمی ئەمریکی‌و زایونیزم .

ئێمەش گەلی عێراق بە کوردو عەرەبەوە بەلێنمان تازە ئەکەینەوە بۆ پارێزگاری کردن لە وولاتەکەمان بە سەرۆکایەتی تێکۆشەر صدام حسین .



# لەگەڵ دیداری

# دووەمی چیرۆکی کوردیدا

● خوێنەری ئازیز :

لە رۆژانی ( ١٧ - ١٩/ئابی/١٩٨٢ )دا ، ئەمیندارێتی گشتیی رۆشنبیری و لاوان ، دیدارێکی بۆ چیرۆکی کوردی کوردی سازکرد کە گەلێ چیرۆک و لێکۆڵینەوەی تێیدا خوێنرانەوەو زۆر بە تێروتەسەلی لە لایەن بەشدارانی دیدارەکەوە ، گفتوگۆو دەمەتەقێیان لە سەر کرا ، سا ئێمەش وا لەم ژمارەیەوە ، بەرودوا هەر جارەی هەندێکیان لێدەخەینە بەر چاوی ئێوەی بەڕێزو هیواداریـن سوودیان لێ ببینن .

« کاروان »

## بروسکەی دیدار بۆ سەرۆکی فەرماندە صدام حسین

بەڕێز سەرۆکی فەرماندە صدام حسین

ئەدیبانو رۆشنبیرانی کورد لەوەبەرو ئائێستاو بۆ لەمەودواش ، هەر بەباوەڕێکی پتەوەوە پارێزگاری لە هیواو ئاواتەکانی جەماوەر دەکەنو هەرچی تینو توانایەکیان لەباردا هەیە ، تەرخانی دەکەن بۆ خزمەتی گەلەکەیان بە کوردو عەرەبو کەمایەتی یە نەتەوەیی یەکانەوە کە وەك برا پێکەوە دەژین . هەروەکوو قەڵەمەکانی دەستیان بۆ پارێزگاری کردن لەو دەسکەوتانەی شورش بەدی هێناون دەخەنەکارو لە پێشیانەوە یاسای ئۆتۆنۆمی کە بۆ ئەوە هاتە کایەوە هەر بمێنێتەوەو بەرەوپێشەوە بچێو گەلی کورد لە سایەیدا ، لە چوارچێوەی یەك عێراقدا بە تەواوی مافە نەتەوەیی یە رەواکانی خۆی شاد بێ .

بەستنی دیداری دووەمی چیرۆکی کوردی و لەم بارودۆخەدا، دووپاتکردنەوەیەکی تری بایەخدانی سەرکردایەتی حیزبو شۆڕشە ، بە بزووتنەوەی ئەدەبیی کوردی و جێبەجێکردنی پێویستی یەکانی نەشونماکردنی ، بەو شێوەیەی لە یاسای ئۆتۆنۆمیدایەو لە پێناوی گەشەپێدانی شێوازە نەتەوەیی یە تایبەتی یەکانی کورو کاڵانی گەلی کوردمان .

بەڵێن بێ ئەی سەرۆکی بەڕێز کە هەموو لە پێناوی بنیادنانی عێراقێکی گەشەسەندوودا کە هەموو لایەك تیایدا بە ژیانێکی سەربەستی سەربەرزدا شادبنو بۆ لەرووداوەستانی هەموو ئەوانەی تەقەڵای کۆسپ هێنانە رێی کاروانەکەمانو شێواندنی دەدەن ئیتر سا لە هەر کوێبنو هەرکێ بەك بن، ببینە یەك دەستو شانوباهوو .

ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە کە سەرکەوتن لە ئەنجامدا بە سەر ئێرانی دوژمندا ، بە سەرکردایەتی ی حەکیمانە ئێوە هەر بۆ ئێمە دەبێ .

محمد محی‌الدین محمد

جێگری ئەمینداری گشتیی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی

سەرۆکی لێژنەی سەرپەرشتی کردنی دیدار



# وتەی ئەمینداری گشتی بەڕێز محمد امین محمد احمد



**بەڕێز وەزیری کارو کاروباری کۆمەڵایەتی .**

**بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەنی ڕاپەڕاندنی ناوچەی کوردستان .**

**بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی کوردستان .**

**هەڤاڵان نهێن پۆش و ئەندامانی شوعبەی هەولێری حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست .**

**بەڕێز سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی حیزبی شۆڕشگێڕی کوردستانی .**

**میوانە بەڕێزەکان .**

**برایانم ، بەشدارانی دیداری چیرۆکی کوردی .**

ئەم دیداری چیرۆکی کوردی‌یەی لە ژێر دروشمی « دیداری چیرۆکی کوردی دیداری قەڵەمە عێراقی‌یە خێرخوازەکانە لە پێناوی بنیادنانی عێراقێکی گەشاوەدا » دەبەسترێ، لە وەختێکدا ساز دەدرێ کە گەلە تێکۆشەرەکەمان لە جەنگێکی سەپێنراودایە بە سەریدا لە لایەن ڕژێمی ڕەگەزپەرستی فارسی‌ی پشتگیراوەوە لە لایەن ئیمپریالیزمی جیهانی‌و زایۆنیزم‌و ڕژێمی گومان لێکراوی سووریاوەو لە وەختێکیشدا کە هێزەکانی زایۆنیزم ، هێرشیان بردۆتە سەر وڵاتی لوبنانی براو ، بەنیازی لەناوبردنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی‌ی فەلەستین‌و هێزە نیشتمانی‌یە لوبنانی‌یەکان‌و دەربەدەرکردنی دەیەها هەزار منداڵ‌و پیرو ئافرەت .

برایان ..

ئەم دیداری چیرۆکی کوردی‌یە ، دووەم چالاکی‌ی ئەدەبی‌ی گەورەیەو لەم بوارەدا دەکرێ‌و حەزدەکەم ئیشارەت بەوە بدەم کە یەکەمیان لە هاوینی ساڵی ( ١٩٧٩)دا لە هاوینە هەواری سەری ڕەش بەستراو ئەویان بە هاریکاری لە نێوان ئەم ئەمینداریێتی‌یەو یەکێتی‌ی نووسەرانی کوردابوو .

ئەم چالاکی‌یە لە ژێر سایەی شۆڕشی حەفدەی تەممووزدا بە سەرکردایەتی‌ی پێشەوای گەل تێکۆشەر صدام حسین سازدەدرێ کە لە پێکگەیشتنەکەیدا لە گەڵ پیاوانی ئایینی‌ی ناوچەی کوردستاندا وتی : ( من تا ئەوپەڕی باوەڕم بە گەشەسەندنی ئۆتۆنۆمی‌و بە پتەوکردنی بە فیکرو بە خوبرەو بە بنیادنانی شەخسی‌یەت‌و پەرەپێدانی فرمانەکانی هەیە ، بۆ ئەوەی عێراقیێتی‌ی هەموومان پتەوتر بێ ) .

ئەمینداریێتی ڕۆشنبیری‌و لاوان لەم چالاکی‌یە ئەدەبی‌یەدا فرسەت دێنێ بەڵێن بە هەموو ئەدیبان‌و ڕۆشنبیرانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی‌ی کوردستان بدا کە بە هەر ڕێ‌وشوێنێك بۆی بلوێ ، لە پێناوی گەشەپێدانی بزووتنەوەی ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی لە ناوچەکەداو یاریدەدانی ئەدیبان‌و نووسەران بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان ، کۆشش بکا .

برایان ..

ئێمە کە وڵاتە خۆشەویستەکەمان بەم پلە ناسکەدا تێدەپەڕێ ئەوپەڕی باوەڕمان هەیە کە ئەدیب لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا دەبێتە دەنگێکی ئامانجدار بۆ پارێزگاری‌کردن لە شۆڕش‌و دەسکەوتەکانی‌و ئامانجەکانی دژی دوژمنانی لە فارس‌و ئیمپریالیست‌و زایۆنیستەکان .

دواجار سوپاسێکی زۆری ئەو خوشك‌و برایانە دەکەم کە بەدەنگ ئەم داوەتەی ئەمینداریێتی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوانەوە هاتن‌و هاوبەشی‌ی ئەم دیدارەیان‌کرد. هیوای ئەوپەڕی سەرکەوتن بۆ بەشداران‌و زیاتر پێشکەوتن‌و پەرەسەندن بۆ هونەری چیرۆکی کوردی دەخوازم ، لە ژێر سایەی شۆڕشی ( ١٧ - ٣٠ )ی تەممووزدا بە سەرکردایەتی‌ی پێشەوای گەل‌و قارەمانی ڕزگاری تێکۆشەر صدام حسین‌و ئیتر سڵاوتان لێ بێ .

# وتەی جێگری ئەمینداری گشتی بەڕێز محمد محی الدین محمد



**بەڕێزان**

**میوانە ئازیزەکان .**

**خوشکو برایانی خۆشەویست .**

بەر لەهەموو شتێك پڕ بەدڵ بەخێرهاتن لـــە هــەموو لایەکتان دەکەم و هیوای شادیتان بۆ دەخوازم .

**بەڕێزان :**

لێتانی ناشارمەوە کە وەختێك منو برایانی تری لیژنەی سەرپەرشتی کردن . سازدانو ڕێکخستنی ئەم دیدارەمان پێ سپێردرا ، هەستمان بەگەلێ پێخۆشحالی کرد . چونکــــە دەمانزانی کە ئەو ئەرکەی خرایە ســــەرشانمان چ بایەخێکی گەورەی بۆ ئەدەبو رۆشنبیریی گەلەکەمان هەیەو چۆن دەبێتە هۆی هەنگاوێکی تر بۆ بەرەو پێشەوە بردنو پەرەپێدانی لقێکی کاریگەری ئەدەبی کوردیمان کە هونەری چیرۆك نووســـینە . بۆیە ئێمەی ئەندامانی لیژنەکە هەر خێرا زۆر بەجۆشـــەوە کەوتینە خۆمانو چامکی ئیشکردنمان بۆ سازدانی دیدارەکـە بەباشترینو ریكو پێکترین شێوە کرد بەلادا . هــــەرچی شارەزاییو تواناو دەسەلات لەچنگدا بوو بۆمان تەرخان کرد. هەر وەکوو ئەمیندارێتی‌یەکەشمان لە جێ بەجێ‌کردنی گشت پێویستی‌یەکانی دیدارەکەدا هیچ درێغی‌یەکی نەکردو هەرچیمان بۆ سەر خستنی بە پێویست زانی‌بێ بەدەنگەوە هاتووە .

هەروەهـــا ئەوەی ئیـــدامەی بە پێخۆشحالی‌یەکەی سەرەتامان دا بگرە تا دەهات پەرەی پێـدەدا . بەدەنگـــەوە هاتنی سەرجەم چیروك نووسانمان بە تایبەتیو گشت ئەدیبو رۆشنبیرانمان بوو کە ئاشکرایە ئەگـــەر چی دەسپێشکەری سازدانو ڕێکخـــستنو ئامادەکردنی پێویستی‌یە مـــادی و هونەری‌یەکانی لە ئێمەی ئەمـــانەتی گشتی‌ی رۆشـــنبیری لاوانەوەیە ، بەلام دیدار دیداری ئەوانەو بۆ ئەوانەو بەوانەوە ئەو سەرکەوتنەی بۆ بەدی دەهات کە ئێمە بە تەمای دەبووینو خۆمان بۆ ماندوو دەکرد .

بەلێ .. سەرجەم چیروك نووســـانو ئەدیبانمان هەر لەسەرەتاوە بەدەنگ بانگـــەوازەکەمانەوە هاتنو ئامـــادەیی خۆیان بۆ بەشدار بوون نیشانداو وەك ووتم : ئەمە زیاتـــــر پێخۆشحالی کردینو هانی داین بۆ زیاتر خۆ ماندوو کردن.

بەڕێزان :

دیارە ڕێکخستنی کۆڕێکی ئەدەبی‌ی وەها . بەتایبەتی کە بەشدارانی لە چەند شارێکەوە بۆ بانگ بکرێن کارێکی ئاسان نی‌یە . بەلام ئێمە پشت بە حوماسەتی ئەندامانی لێژنەکە . بۆ هەلسووراندنی کارەکەو ، بە ناردنی چەند ئەندامێکی لێژنەکە. بۆ شارەکانو پەیدەندی کردنی راستەو خۆیان بە ئەدیبانەوەو هێنانو بردنی نووسینەکانیان بەخێراییو یەکسەر ڕێکەوتن لەگەل خۆیاندا . ئەو گرفتەمان چارە ســـەر کرد . بـــەوە گەیشتینە دانانی پرۆگرامی دیدارەکە کە ئەمە ئـــەرکە هەرە گرنگەکەمان بوو . بەلام لەم بوارەدا دەبێ دوو شـــت روون بکەمەوە . یەکەمیان هێنانەنەوەی عوزر خوایی‌یە کـە نەتوانرا چیرۆکی چەند برادەرێکی چیرۆك نووس و لێکۆلینـــەوەیەکی برادەرێکی تر بخرێنە ناو پرۆگرامەوەو ئێمە لەلای خۆمـــانەوە زۆر سوپاسی ئەو هەولدانی بەشدار بوونەیان دەکەین .

دووە میشیان : هەمدیسان عوزرخوایی هێنانەوەیە کـــە نەمانتوانی چیرۆکەکانی ناو پرۆگرامەکە بە چاپکراوی بخەینە بەردەم دیدارەکە ، وەك بە لێنمان دابوو .

بێگومان ئێمە نامانەوێ بەدوورو درێژی باسی ئــــەو ئەرکانە بکەین کە بۆ سازدانی دیدارەکە جێ بەجێمان کردوون. ئەرکەکان زۆرن . هەر لە راکەی نێوان شارەکانەوە بیگرە تـا دروستکردنی باجو ئامادەکردنی هۆلو بیتاقەی بانگ‌کـردنو نووسینی دروشمو ئامادەکردنی شوێنی نووستنو حەوانەوەو هەتا دوایی . بەلام حەز دەکەین ئەوە بلێین کـــە ئێمـە دوو بڕیارمان داوەو دەهێنێ ئیشارەتیان پێ بدرێ ، یەکەمیـــان : ڕێزلێنانی شەش لە پێشەنگانی کاروانی چیرۆکە کوردی کە بۆ یەکەمجارە دەکرێ ، دووەمیان : ناو نانی دیـــدار بەدیداری دووەمی چیرۆکی کوردی . ئێمە ئەگەر چی ڕێکخەری دیـداری یەکەم نەبووینو بە یاریدەدان هاوبەشیمان تێدا کردووە . بەلام



گرنگ بەلامانەوە بەستنی دیدارەکەیە کە هیواداریین لەدوا رۆژدا دیداری سێیەمیش و چوارەمیش و هەتا دوایی . بەستریٚ . بۆ پتەو کردنی بناغەی یەکیەتی نیشتمانی بنیات نانی عراقێکی دیموکراتیانەی پێشکەوتو ، بۆ ئەوەی ژیانێکی ئاســــوودەو کامەران بۆ گەلی عیراق بەگشتیی و رۆلەکانی گەلی کوردمــــان بەتایبەتی دابین بکەین لە چوار چیوەی ئۆتۆنۆمی کوردســـــتانی عیراق بە سەرۆکایەتی هەڤالی تێکۆشەر صدام حسین .

لە کۆتاییدا بەگەرمەوە سوپاسی ئەرك کێشانی هــاتنی هەموو لایەکتان دەکەم و لە کانگای دڵەوە هیوای ســـەرکەوتن بۆ بەشدارانی دیدارەکەو بۆ دیدارەکە دەخوازم.

* **سەرکەوتن بۆ عیراقی خۆشەویستمان .**
* **مردن و سەرشۆڕی بۆ دوژمنانی عیراقی شـــۆڕش .**
**ئیتر سوپاس ...**

# وتەی یەکێتیی نووسەرانی کورد

**بەڕێز محمد ملا کریم**

**خوشکان ! برایان !**

**بە ناوی یەکێتیی نووسەرانی کوردو دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتییەوە پیرۆزباییی ئامادەکردنو بەستنی ئـەم دیدارەی کوردی ئەکەم کە دیداری دووهەمە .**

وەك لەیادتانە دیداری یەکەم سێ ساڵ لەمەو پێش بــە هاوکاریی یەکێتیمانو ئەمینداریێتی گشتیی رۆشـــنبیرانو لاوان ئامادە کراو لە مێژووی ئەدەبی کوردو ڕەوتی پـــیرۆزی چیرۆکی کوردیدا نیشانەیەکی دیاری بوو و شوێن پەنجەیەکی ئاشکرای بە تێکرای ڕەوتی نەتەوەکەمانەوە بەجێ هێشت .

دیداری ئەمساڵمان هەر چەند بە دیمەن تەنهـــــا لە لایەن ئەمینداریێتیی رۆشنبیرانو لاوانەوە ئامادە کراوە، بەڵام لە ڕاستیدا بەرهەمی هاوکاریی هەردوو لامانە، چونکە زووربەی هەرەزۆری بەشدارانی ، هەر ئەندامانی یەکێتییەکەمانن کـــە ئەوەش نیشانەی پایەی بڵندو بەرزی یەکێتییە لە ژیـــانی کولتووریی گەلی کوردو لە دلی ڕۆشنبیرانی نەتەوەکەماندا .

هەر چۆن بێ ، ئێمە هەمیشە ئەنجامەمان لە دیمــــەن لامەبەستترەو ، ئەم دیدارەش بە دیداری هەموو لایەکمـــان دائەنێینو ، پیرۆزبایی لە ئەمینداریێتیی رۆشـــنبیریو لاوان ئەکەین بەرابەر بە ئامادەکردنو بەستنی دیدارەکەو هەروەهـــا بە تەقەلای پیرۆزی بۆ خزمەتی ئەدەبی کورد .

ئاواتە خوازی سەرکەوتنی دیدارەکەو پێشکەش کردنی چیرۆکی خزمەتگوزاری گـــەلو ، لێکۆلینەوەی ڕێگـــا ڕوون کەرەوەین بۆ ئەوەی چیرۆکی کوردی ڕۆژ بە ڕۆژ لە جاران زیاتر پێوەندی بە ژیانی جەماوەری کوردو بە تایبەتی ژیـــانی ڕەنجکێشانی کوردستانو عێراقەوە هەبێ .

**سەرکەوتووبێ دیداری دووهەمی چیرۆکی کوردی !**

**هەر شەکاوە بێ ئاڵای بەرزی وشەی پیرۆزی کوردی لە خزمەتی گەل و نیشتمان و یەکێتیی نیشتمانیماندا !**



# بەیاننامەی کۆتایی پێهێنانی دیداری دووەمی چیرۆکی کوردی ١٧ - ١٩ / ٨ / ١٩٨٢ - هەولێر

لەژێر دروشمی « دیداری چیرۆکی کوردی دیداری قەلەمە عێراقی‌یە خێرخواکانە لەپێناوی بنیادنانی عێراقێکی گەشاوەدا » ، لە ڕۆژانی ١٧–١٩/٨/١٩٨٢دا دیداری دووەمی چیرۆکی کوردی لە هەولێردا ، بەدەس پێشخەری‌ی ئەمینداریێتی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوانی ئۆتۆنۆمی لە ناوچەی کوردستانداو بە هاریکاری لە گەڵ یەکێتی‌ی نووسەرانی کوردا سازدراو پتر لەشەست چیرۆك نووس‌و ڕەخنەگرانی ناوچەی کوردستان‌و هەندێ شوێنی تری وڵات بەشداری‌یان تێداکرد، هەروەکوو ژمارەیەکی زۆریش لەوانەی ئامادەی کۆبوونەوەکانی دەبوون لە ئەندامانی یەکێتی‌و کەسانی‌تر ، بەشداری‌یان لە گفت‌و گۆو دەمە تەقێکانیدا دەکرد .

**دیدارەکە بە وتەیەکی ئەمینداری گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوانی ناوچەی کوردستانی خاوەن ئۆتۆنۆمی مامۆستا محمد امین محمد احمد دەست پێ‌کرا کە لەوتەکەیدا ڕێزی لە دیدارەکە ناو هیوای ئەوەی خواست کە بەدوایدا وێنەی دووبارە بکرێتەوەو هەر یەکەیان ئەنجامێکی بەرفراوانتر بە ئەدەبی کوردی بەگشتی‌و چیرۆکی کوردی بەتایبەتی ببەخشێ، هەر وەکوو وتی کە بەستنی ئەم دیدارەو چالاکی‌یەکانی تری لەبابەتی میهرەجانی ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی لە ناوچەی کوردستاندا ، یەکێکە لە بەرو بوومی ئۆتۆنۆمی کە بۆ یەکەمجار لە عێراقدا لە ژێر سایەی شۆڕشی ( ١٧ )ی تەمووزو سەرکردایەتی‌ی سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسیندا کاری پێ‌کرا .**

هەروەها سەرۆکی لیژنەی سەرپەرشتی کردن‌و جێگری ئەمینداری گشتی ڕۆشنبیری‌و لاوان مامۆستا محمد محی‌الدین وتەیەکی تری خوێندەوەو ئینجا بەدوایدا مامۆستا محمەدی مەلا عبدالکریم جێگری سەرۆکی یەکێتی‌ی نووسەرانی کوردیش وتەیەکی خوێندەوە .

لەسێ ڕۆژەکەی دیداردا گەلێ چیرۆك‌و ڕەخنەو لێکۆلینەوە پێشکەش کران‌و بە بەشداربوونی زۆر لە ئامادە بووان ، بە دوورو درێژی گفت‌و گۆیان لەسەر کراو سوودیان زیاتر لێ لێ وەرگیرا . لە ڕۆژی یەکەمی دیدارەکەدا چیرۆك نووس محمد مولود مەم باسی تاقیکردنەوەی خۆی لە هونەری چیرۆك نووسیندا کرد . بە دوایدا چیرۆك نووس ڕەزا سەید گوڵ چیرۆکێکی بەناوی ( خەون‌و خەم )ەوە خوێندەوەو ڕەخنەگر فؤاد مجید میسری هەڵیسەنگاند . ( هەڵسەنگاندنەکەی یەکێکی تر لەباتی ئەو خوێندی‌یەوە ) . ئینجا بەڕێز رؤوف حسن لێکۆلینەوەیەکی بە ناونیشانی ( خۆماڵێتی لە چیرۆکی کوردیدا )ی پێشکەش کرد . لەڕۆژی دووەمدا ڕەخنەگر ناصر یوسف لێکۆلینەوەیەکی بە ناونیشانی ( خوێندنەوەیەکی جیهانی چیرۆکەکانی جلیل قەیسی ) پێشکەش کردو محمد سعید حسن لێکۆلینەوەیەك بە ناونیشانی ( پاڵەوان‌و ڕووداو لە چیرۆکی کوردیدا )و ئینجا چیرۆك نووس جلال محمود علی چیرۆکێکی بە ناوی ( بووك‌و بەفر )و چیرۆك نووس عبداللە سراج چیرۆکێکی بە ناوی ( برایە شۆڕاوی )یەوە خوێندەوەو ڕەخنە گر حسین عارف هەڵیسەنگاندن . هەر وەکوو



لەگەڵیاندا چیرۆك نووس رشید فندیش چیرۆکێکی بەنــــاوی ( مەمۆ )وە خوێندەوە . ئینجا هەر لەو رۆژەدا دوکتۆر نافــع ئاکرەیی لێکۆڵینەوەیەکی بە ناونیشانی ( نامۆبوون لە چیرۆکی کوردیدا )ی پێشکەش کرد . لە رۆژی ســــێیەمدا کـــە دوا رۆژبوو ، چیرۆك نووسان مصطفی صـــالح کریم چیرۆکی ( مەلە کان بەرەو کوێستان ئەگەڕێنەوە ) و عبداللە عزیز خالد چیرۆکی ( لە ئاهەنگی شەوێکی ئەم شارەدا ) و رؤوف بێگەرد چیرۆکی ( هەڵۆ یان خوێندەوەو رەخنەگر رؤوف عثمـــــان هەرسێ چیرۆکەکەی هەڵسەنگاندن . هەروەها رەخنەگـــــر حسن عباس جاف لێکۆڵینەوەیەکی بە ناونیشانی ( پاڵەوان لە چیرۆکەکانی لەتیف حامیدا )ی پێشکەش کرد . ئینجا هەر لەم رۆژەدا چیرۆك نووسان محمد صالح سعید چیرۆکی ( تابلۆی دێرە رەوگەیەکی کاروان )و صلاح شوان چیرۆکی (ئەستێرە بەرزە ) و سلام مەنمی چیرۆکی ( سکرتێر ) یــان خوێنــدەوەو رەخنەگر اکرم قەرەداغی چیرۆکەکانی هەڵسەنگاند . بە دواییاندا بەڕێز عبدالرزاق بیمار لێکۆڵینەوەیەکی بـــە نـــاونیشانی ( خوێندنەوەیەکی رەخنەگرانەی کۆمەڵە چیرۆکی - پرد - )ی پێشکەش کرد .

هەروەها لەم رۆژەدا بە خەڵات کردن رێز لە پێشەنگانی کاروانی چیرۆکی کوردی ( جمیل صائبو پیرەمێردو محمد علی کوردیو علاءالدین سجادیو شاکر فتاح ) نراو لەگەڵیـــاندا هەمان رێز لە چیرۆك نووسی کوردو نووسەر بەزمانی عەرەبی عبدالمجید لطفی نرا . رێزلێنانی ئەوانە لـــە لایەن ئەمینداریێتی گشتیی رۆشنبیریو لاوانەوە بوو . هەر وەکوو ئـــەدەب دۆست مامۆستا بابکر محمود رسول وەزیری کارو کاروباری کۆمەڵایەتی دیاریی رێزلێنانی خۆی پێشکەش بە چوار لـــە چیرۆك نووسانو رەخنە گران کرد کە دران بە بەڕێزان رؤوف حسنو عبداللە سراجو حسن جافو لەگەڵیاندا مامۆســــتا جلیل قەیسی ئەنجامی ئەو دۆستایەتییە تایبەتییەی لەگـەڵ چیرۆكو ئەدەبی کوردیدا هەیەتی . جگە لەمان مامۆستا بابکـر محمود رسول بەدوو دیاریی تر رێزی لە بەڕێز ســەرۆکی لێژنـــەی ســـەرپەرشتی کـردنی دیدارو بەڕێوەبەرێتیی رۆشنبیریی جەماوەر لە هەولێر نا بۆ ئەو کۆششەی لــــە سازدانی دیدارەکەدا نواندوویانە .

بەشــــدارانی ئەم دیدارە بەو پەڕی پێخۆشحاڵییەوە دیدارەکەو ئەنجامەکانی دەنرخێنن . چونکە ئەو لێکۆڵینەوانەی لە رۆژانیدا پێشکەش کران ، سەرەڕای هەموو ئـــەو کەمو کوورییو کەلێنانەشی کە لەلایەن گفتو گـــۆ کـــەرانو رەخنەگرانەوە تیایاندا دەسنیشان کران ، تەواو بریتی بوون لەو لایەنانەی چیرۆکی کوردی کە دەبوو لێیان بکۆڵرێتەوە . هەر وەکوو ئەو چیرۆکانەی خوێندرانەوە ، بەڵکوو نیشانەی



پێشکەوتنی چیرۆکی کوردیو هونەری چیرۆك نووسین بوون لەلای چیرۆك نووسانی کورد . وەکی تر ئەگەرچی مـــاوەی خۆ ئامادەکردن بۆ بەستنی دیدارەکە لەو ساتەوەی فیکرەی بەستنی سەری هەڵداو تا کاتی سازدانی ، کەمو کورت بوو کە ئەوە بێگومان کاری کردبووە سەر خۆ بۆ ئـــامادەکردنیو بەتایبەتی بۆ چیرۆك نووسو رەخنەگرەکان ، بەڵام لەگـــەڵ ئەوەشدا دیدارێکی سەرکەوتووی ئەوتۆ بوو کە پڕی بوو لە گەرمو گوڕیو چالاکیو بەتەنگەوە هاتوویی . ئێمە وا داخوازی دەکەین کە ئەو شارەزاییەی لە دیداری یەکـــەمەوەو لـــەم دیدارەدا لامان کەڵەکە بوو ، بۆ بەستنی دیداری ســـێیەم سوودی لێ ببینرێو لە رووی ئەو وەختەوەی پێش بەستنی دەستی دەدرێتێ ی حسابی بۆ بکرێ .

لێکۆڵینەوەکانی دیدارەکەو ئەو چیرۆکانەشی تیایــــدا خوێنرانەوە ، ئەو هەقەمان دەدەنێ کە بڵێین: ئێستا چیرۆك نووسی کوردو رەخنەگری کورد وایان لێهاتوە کە پتر لــــە هەروەختێکی تری لەوەبەر ، بەندی خەمو ئەندێشەو هیواو ئاواتەکانی گەل بن ، لەپاڵ ئەوەشدا کە بەردەوام چاو دەبڕنە ســوود بینین لە سامانی چیرۆك لە جیهـانداو لە پێشکەوتنی ئەم هونەرە تیایدا ، بە تایبەتی لە ناوچەی عەرەبیدا کە زمانی عەرەبی تا ئێستاش پردێکی سەرەکییەو زۆربەی نووسەرانو خوێنەرانی گەلەکەمان بە رۆشنبیریی جۆراو جۆری جیهانەوە دەبەستێتەوە .

**ئێمە لە کاتێکدا کە ئەم بەندە دووپات دەکەینەوە ، حـــەز**



**دەکەین بۆ مسۆگەرکردنی رۆیشتن لەسەر ئەم رێبازە ساغڵەمە ، پێ لەسەر هەندێ مەسەلەی کاریگەریش دابگرین کە بەبێ ئەوانە ناتوانین ئەوەی دەمانەوێ بەدیی بهێنین ، بۆ نموونە : ئەگەرچی بایەخدان بەپارە سەرف کردن بۆ کاروباری رۆشنبیری‌ی کوردی ، تا رادەیەکی هەست پێکراو لەچاو لەوەبەردا دەبینرێ ، بەڵام ئێمە بە هۆی ئەو دواکەوتەیی‌یە کەڵەکە بووەوە لە رووی رۆشنبیری‌یەوە لەلای گەلی کوردمانو لە ئەنجامی وەزعی دژواری رۆشنبیرانی کورددا لەرووی دارایی‌یەوە ، پێ لەسەر ئەوە دادەگرین کە پێویستە دەزگا رۆشنبیری‌یە رەسمی‌یەکان زۆر زیاتر لە ئێستایان باوەش بۆ چاپکردن بە کوردی بکەنەوە . ئێمە دووپاتی دەکەینەوە کە پێویستە مەکینەو ئامێری چاپکردنی تازە بابەتو پێشکەوتوو لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا دابمەزرێنرێو رێگای بڵاوکردنەوەی بەرهەم بۆ رۆشنبیرانی خۆش بکرێ . هەر بەم بۆنەیەشەوە دەمانەوێ ئێشارەت بە کۆتو پێوەندی چاودێری ( رەقابە )ی چاپەمەنی بدەین کە دەبێ بە هەر شێوەیەك بێ ، کارێکی وەها بکرێ ئەو ئەرکو زەحمەتی یە لەسەر شانی نووسەری کورد سووك بکرێ کە لەم بوارەدا تووشی دێ .**

ئێستا وەزعەکە وای لێهاتوە کە زۆربەی دانەرانو لەگەڵیاندا چیرۆك نووسانیش ، زەحمەتە بتوانن خۆیان کتێبەکانیان لەچاپ بدەن ، بۆیە کار رووی لەوە کردوە کە ئەم مەسەلەیە بکەوێتە ئەستۆی دەوڵەتو بە ناچاری ئەو چارە سەری بکا . بەم جۆرەو بۆ ئەوەشی هەل بۆ هەر گوڵێك هەڵبکەوێ کە بکەشێتەوە ، وای دەبینین کە دەبێ لە مامەڵە کردن لەگەڵ نووسەراندا سەرنجێکی سەراپایی‌ی هەبێو دەسبەرداری ئەو باری سەرنجە وشکە ببێ کە لە لایەن ئەم یا ئەوەوە و سەبارەت بەم شێوەی نواندن یا ئەو شێوەو لای ئەم نووسەر یا ئەو نووسەر دەبینرێ ، گومانیشی تێدا نی‌یە کە ئێمە لێرەدا لە سنووری ئەو چوارچێوەیەدا دەدوێین کە هەموومان پێکەوە کۆ دەکاتەوە کە دڵسۆزی‌یە بۆ نیشتمانو بۆ گەلو بۆ مەسەلەی شۆڕشو بۆ ئەو بەهاو نەریتە بەرزە مرۆڤایەتی‌یانەی کە هەر نووسەرێکی خێر خواو بەشەرەف لە هەر قورنەیەکی ئەم سەر زەمینەدا بێ بە ئاواتی‌یەوە دەبێ .

لە دیدارەکەدا زۆر جار مەسەلەی شارەزا کردنی برا عەرەبەکانمان سەبارەت بە بەرهەمی چیرۆکو رەخنەی کوردی هێنرایە کایەوەو قسەی لێوە کراو لە هەموو لایەنەکانی‌یەوە چارە سەر کرا ، بەشدارانی ئەم دیدارە حەز دەکەن ئەو شتە سەرەکی‌یەی باسەکە دووپات بکەنەوە کە بریتی‌یە لە دانانی پروگرامێکی ناوەندی لە لایەن دەوڵەتەوەو بە رێکخستن لەگەڵ یەکێتی‌ی نووسەرانی کوردا ، تا بتوانرێ گوڤارێکی رۆشنبیری دەربکرێ کە بەزمان عەرەبی بێو بە ناوەرۆك کوردی‌و بەشێك لەو ناوەرۆکەش چیرۆکی کوردی وەرگێڕدراوبێ . هەر وەها دەرکردنی کۆمەڵە چیرۆکی کوردی‌ی وەرگێڕدراو بۆ عەرەبی ، وەك ئەوەی لە ساڵێکدا دوو جار بێ . جگە لەمانە بە ئاواتیشەوەین کە ئەو گوڤارە عێراقی‌یانەی بەزمانی بێگانە دەر دەچن ، نموونەی ئەدەبی کوردی‌یان لە چیرۆکو شیعرو هەندێ نموونەی لێکۆڵینەوە دەربارەیان تێدا بێ . ئەوە کەمترین شتەو بۆ ناسینی ئەدەبەکەمان بە گەلانی تر کە لە نێوان چاپەمەنی‌یە عێراقی‌یەکانەوە عێراقیان پێدەناسرێنێ ، دەبێ بکرێ .

هەروەها بەشدارانی دیدار پێشنیازی بەستنی دیدارێکی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوە لە فۆلکلۆری کوردی لەساڵی داهاتوودا دەکەن .

بەشدارانی ئەم دیدارە جارێکی‌تر پابەندی‌ی خۆیان بەرێبازیانەوە لە پتەوکردنی یەکێتی‌ی نیشتمانی‌و توندو تۆڵکردنی برایەتی‌ی نێوان هەردوو گەلی عەرەبو کوردو گشت کەمایەتی‌یە نەتەوەیی‌یەکان لە نیشتمانماندا دووپات دەکەنەوە، لەگەڵ کۆشش کردنیاندا لە پێناوی زیاتر من گەشە سەندن بۆ عێراقی خۆشەویستمان بە بیروباوەڕو بە قەڵەمەکانیانو بۆ پترو پتر چەسپاندنی ئۆتۆنۆمی . ئەوان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە خۆ پڕ چەك کردن بە چەکی ئایدۆلۆژی‌و رۆشنبیری‌و پەرەپێدانی بەهرەو تینو توانایانو رۆیشتن شان بە شانی پێشکەوتنی هونەری چیرۆك نووسین لە جیهانداو لە ژێر دروشمی ئەدەب لە خزمەتی گەلداو لە خزمەتی راستیداو لە خزمەتی جوانی‌و بەهاو نەریتی باڵای مرۆڤایەتیدا و لە پێناوی مەسەلەی پێشکەوتندا ، بە پێویست دەزانن .

تا یەکتری بینین لە دیدارێکی تردا خوامان لەگەڵ .



# محمد مولود مەم و تاقی کردنەوەی لە چیرۆک نووسیندا

**بەرێزان**

رەنگە هەندێك لە ئێوەی بەرێز وایان دانابێ کە تاقی کردنەوەکانی نووسەرێك .. شتێکی تایبەتیە ، واتا زاتیەتێکی صرفە ، ئەگەر بە تەمای ئەوە بن ، چۆن لەبەر دەکەم ، چۆن دەخۆم ، چۆن دەخەوم ، .. ئەوا حیساب بکەن رەنجی ئەمرۆمان بەخەسار چوو !!

پیرێژنەکەی دایکم دەیگوت ئەگەر جۆی زەرد کراو ( واتە نیوە کولاو ) بدەی بەمریشکی هێلکە کەر ... هێلکەی زیاد دەکات !! تاقی کردنەوەکانی زانستیش دەرمانی وایان دۆزیوەتەوە کە هێلکەی مریشکی پێ رەنگاو رەنگ دەبێ !!

رەنگە ئەمانە راست بن ، بەلام نووسەر ئەم جۆرە تاقی کردنەوانەی لێ نایێن !!.. مەرج نی یە هەورە تریشقە یان باران ، یان زەردە پەر .. یان مانگی چواردە دەرگای ئیبداع بۆ نووسەر بخاتە سەر پشت ، یان دیمەنی جوان ، کچی جوان .. گولی جوان ، شاعیر وەشیعر بهێنێ !!



بەم رەنگە بە خەیالی بچوکانەی خۆمان ئاشمان دورستدەکرد .. هەتا ئاوەکەشمان پتر دەکرد ئاشەکە بە گورِتر دەسورِا،کە ئاوەکەشمان چلکدەکرد،ئاش دەوەستا !!.. وردەوردەش ئەومان بۆ روونبوەوە کە ئەگەر ئاوەکە لە بەرزاییەوە بەرەوخوار ببیتەوە بە گورِتر دەبێو تەوژمی بەهێزتر ، ئاشەکەش توندترِ وەگەرِ دەخا . کە شارۆچکەشمان دورستدەکردن ، بە تاقی‌کردنەوە دەگەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە هەتا بناغەی خانووەکەمانی شارۆچکەکەمان پانترو بەتینتربن ، دەتوانین کۆشکی بەرزترو نهۆمی زۆرتر بە سەریەکەوە دەنێین ، هاوینان لە گۆرەپانەکەی پشتمالان ،

بەرای من تاقی کردنەوەی نووسەر هەر چەندە زاتیش بێ دەبێ بەشێك بێ لە تاقی کردنەوەکانی کۆمەڵەکەی ، لەبەر ئەوە تاقی کردنەوەکانی من پتر گشتینو پەیوەندیان بە باری گشتی گەلەکەمەوە هەیە .. لەبەر ئەوە .. لەو مەودایەدا دەچمە ناو .. باسەکە ..

کە مندال بووم . لە گەل زارۆکانی گەرِەك دەچوونیە سەر جۆگەلە ئاوەکە ، لە دارهەنجیرەکە كارِکە هەنجیرێکمان دەچنی .. تەوەرێکی دارمان بە ناوەندیدا رایەلْدەکرد ، بە زلکەدار ، بە دەورەی هەنجیرەکە پەرِمان دەچاند ، ئیمجا بەسەر جۆگەلەکەدا هەلمانذەخست ، کە پەرەکان دەگەیشتنە ئاوی جۆگەلەکە .. هەنجیرەکەیان دەسورِاند ، لەگەل سورِی هەنجیرەکە ئێمەیش بە دەورەی خۆماندا دەسورِاینو دەلەرزین .. بانگمان دەکرد :

ـ هۆ .. ئاشەکە سوورِا .. ئاشەکە کەوتە گەرِ !! .



ئەناو جۆگەکە ، بە بەری پێ شەقاممان دەکێشان ، هەندێکمان شەقامی راست ، هەندێك کەوانی هەندێك بازنەیی‌و جوارگۆشەیی ، بەڵام ئەو منداڵە دەبووە سەر دەستەو ئازایی دەبردەوە کە جادەی پێچاوپێچی پڕ کۆسپ‌و قۆرت‌و هەڵدێرو ئاۆزی دەکێشان‌و بەراکردن، بێ‌هەڵەو بێ‌وەستان بە سەریدا دەچووەوە . ئەمانە یادگاری سەردەمی منداڵین ، رەنگە ئێرە جێگای گێڕانەوەیان نەبێ بەڵام چونکی پەیوەندیان بە ...فی‌کردنەوەکانەوە هەنە هەر بۆ نموونە هێناومەتەوە .

* ■ *

گوندەکەم چۆن هەموو جوانی سروشتی تێداکۆببووەوە ، ساردوسڕی بەفری زستان لەو جوانییە سروشتیەی پتر دەکردو باری ژیانی خەلکە هەژارەکەی گرانتر دەکرد .. هەروا هەموو تناقضات‌و نالەباری ژیانیشی بەکۆڵەوەبوو !! لەو گوندەم ، جوولەکە ، دیان ( مەسیحی ) ، کرمانج بەگزادە ، ئاغا .. لەسەری ئەم بەشانەش دەستەی پیاوانی حکومەت‌و بنەماڵەی میرەکان وەکو دێو .. دوولینگیان داکوتابو ... جوولەکە ، لە پاش دیانەکان . ئەمانەش لە دوای کرمانجەکان ..کرمانجیش لە رکێف بەگزادەو ئاغاکان دەگەیشتنە سەرەوە .. دەولەمەندی جوولەکەو دیان لە کرمانجی هەژار بەرێ‌وجێ‌تر وەردەگیران ، کرمانجی دەولەمەندیش لە بەگزادەکان بەرووەت‌تر بوون ، مەلا ریش سپیەکەش هەر پێنج فەرزە بەسەر قووچکەی مزگەوت دەکەوت بانگی یەکسانی رادەهێشیت ، ئەوەی لەم چۆنیەتیە سەرنجی ڕادەکێشام ئەوەبو کە هەموو ئەم بەشە بەشخوراوانەش لەگەل یەکدا ناتەباو دوودڵ بوون ، تاقە شتێك کە کۆی دەکردنەوە ... بەزار خواپەرستی‌و بەکردار رازی‌کردنی میرو میری‌بوو ..

بەم رەنگە دەوری منداڵیم لەگەڵ شەڕەگەڕەك رابوارد.. گوێچکەم پر باسی دزی‌و پیاوکوژی زەوت‌کردن‌و جەورو ستەم‌بو ، گەلێك جار دەم‌دیت پۆلیس .. بە لیس خەلکی گوندیان کۆدەکردنەوە.. وەك ڕانەمەر بۆ بێگار لێیان‌دەخوڕین!.

زۆر جار لەگەڵ خۆما دەم پرسی : ــ چۆن ئەم هەموو خەلکە رەشورووتە .. بەکرێ‌و بەبێ سەرپێچی ئەوها مل‌دەدەن ؟! وەلامی ئەم پرسیارەم ئەو کاتە چەنگ کەوت کە بووم بە شوانی رەوەیێك عەلەشیش ؛ بەیایێن شوورکە دارێکم وەدەست دەگرت کە ڕامدەوەشاند گفەی دەهات ، قەلەموونەکانم دەدانە پێش‌خۆم ، تەنانەت قەلەمونێك لە ڕەوە دەرنەدەچوو !! وەلامەکەش .. وەکو لێکدانەوەو پرسیارێکی‌تر بوو کە بە خۆم دەگووتەوە :

بزانە چۆنیەتی خەلکی گوندو . ئەم عەلەشیشانە چەند وەیێك‌دەچن ؟! .. دە بە خەیاڵی منداڵانەی خۆم .. عالەمی گوندەکەم دەکرد بە دوو بەشەرە .. بەشێکی پۆلیس‌و بەشەکەی‌تری عەلەشیش !!..

* ■ *

لە پۆلەکانی سەرەتایی قەشەی بەڕێز « جبرائیل شێر» مامۆستای زمانی کوردیمان‌بوو . ئەم ئینسانە مەزنە خوێنی خۆشەویستی‌ی ئەدەب‌و زمان‌و ولات‌و کەلەپووری نەتەوەکەمی لە دەمارەکانمدا جولاندەوە،ئەو حاجی قادری کۆیی پێ‌ناساندم،

جوانی‌ی شیعری نالی‌و وەفایی‌و ئاوات‌و ئازاری مەم‌و زینی رژاندە گیانم ، ئەگەرچی مامۆستای یەکەمم دایکم‌بوو .. بە چیرۆکی فولکلوری‌و ئەفسانەو پەندی پێشینان فرچکی دابووم .. بە باس‌وخواسی سەفەربەرو گرانیە گەورەکەو رشانەوەو .. رۆژە نالەبارەکانی [illegible]ەکەمان کولانگەی ژیانی بۆ کردبوومە ، بەقارەمانیەتی ، پ[illegible]ی دمدم‌و شیخ فەرخ‌و خەج‌و سیامەندو برایموك‌و لەیل‌و مجروم تێر شیری کردبووم ، بەلام ئەم قەشە مەزنە ئەو شیرەی پێ کردم بەخوێن‌و هێسك‌و گۆشت . شانەکانی لەشمی پێ گورج‌و گۆڵ تر کردم تاکو قۆناغی سەرەتاییم تەواو کرد شیعرەکانی حاجیم دەور دەکردنەوە چیرۆك‌و ئەو قسانەو سەربوردەکانی دایکم لەلا روونتر دەبوونەوە . بۆ [illegible]ناخی خوێندنی ناوەندی کەوتمە باوەش ، شارە پیر[illegible] بەرێزەکەی هەولێر لەم شارەدا پتر بەژیان ئاشنا بووم ،کەوتمە ناو رێکخراوەی نیشتمانی ، بەو هۆیەوە لایەنی تری ژیانم بۆ روون بوونەوە فێری زمانی عارەبی بووم ، لەتەك دیوانە کۆنەکەی حاجی‌و تایەر بەگ‌و شێخ‌رەزاو دیاری و یادگاری لاوان‌و کتێبەکانی منفلوطی و زیات‌و احمد و سەلامە موسی و ذنون ایوب و عەبە سیوسم کردنە هۆگرو دۆست ، بەهۆی ئەمانەشەوە دەرگای ئەدەبیاتی عەرەب‌و رۆژ هەلات‌و رۆژ ئاوام بۆ کرایەوە ..

ئەفسانەکانی هیندو گریکی خوێندنەوە ، ئاشنایيم لەگەڵ بلزاك پەیدا کرد ، چونیەتی مردنی لوردیا بردن‌دلتەنگی دەکردم، چیرۆکەکانی موباسان کۆمەلێکی لە کۆمەلەکەی خۆم فراوانتریان پێ دەناساندم ، جوانیم لەگەڵ لارتین‌و شاتوبریان هەڵدەچوراند ، رِك‌و فرمێسکم بۆ جان فالجان‌و مام تۆما هەڵدەرشتن ، ئازارم تێکەڵ بە ئازارەکانی تۆلستۆی‌و ئازارەکانی فیرتەر دەبوون .

لەو رۆژانەدا .. شەڕی جیهانی دووەم هەموو دونیای گرتبوەوە لەگەڵ مەلا کوێرە بیر رووناکەکە دەم گوتەوە : ـ

**ئەم رۆژە چ رۆژێکە کە دونیا شلەژاوە ..**
**هەر کەس بە جەخاری جیگەری قیمە کراوە..**

منیش بە ڤەریکیەوە بەرەنگاری رێگای سەختی ژیانی‌بووم ، ژیانی منیش شلەژا .. برسیەتی پتر پێی پێوە نام ناچار قوتابخانەم لەگەل ئاهێکی سارد بۆ دەرەوەی سنوری ژیانم تێ هەلدا . خۆم هاوێشتە ناو گێژەلووکەو گەرداوی ژیان ، پێویست‌بوو نان بۆ خۆم‌و پاشماوەی باوکە کۆچ کردووم پەیدا بکەم ، لەو ماوە درێژەی لە سنوور فرمانبەر بووم ، کەوتمە ناو لەعنەتی سنوور و بەتەواوی خزامە ناو کانگای دەردی کۆمەڵ ، ناو جەرگەی رووداوی تاڵ‌و سوێرو ملم بەکەندو کۆسپی چیای سەختی ژیانەوە نا .. لەو ماوەدا گەلێك راستی ئەم ژیانەم بۆ دەرکەوتن ، هەولم دا ئەو راستیانەی من دەیان بینم‌و هەستیان پێ دەکەم، لەپێش چاوی رەشوو رەوونی خەلك قیتیان بکەمەوە ، هەستی ئەوانیش بجولێنمەوە ، ئەوەل جار رێگەی شیعرم گرتە بەر لام وابو دەتوانم بەم رێگایەوە بکەم بە هەوارگەی دلی ئەوان ، بەلام پاش ماوەیێکی کورت .. ئەم رێگایەم لێ وون بوو !! .. ئەو سەردەمە کتێب لەنان هەرزان تر بوو پتر کتێبم دەخوێندنەوە، جگە لە ئەدەبیاتی کۆمەلە سیاسیەکانی ئەو سەردەمە چیرۆك نووسە گەورەکانم ناسین،چیخەف ناسی ، خۆزیام دەخواست بتوانم وەك ئەم نووسەرە نەمرە بچمە ناو دەروونی ئینسان‌و ببم بە بەشێك لەخەمی کۆمەلەکەم . چیخەف رێگای چیرۆك نووسین نیشان دام ، پالی پێوە نام قولتر بەدەریای ئەدەبی



چیرۆکدا نقوم ببم ، ئاشنایيم لەگەڵ تۆلستوی‌و دستوفسکی و گۆرکی پەیدا کرد ، لەو سەردەمەی ئەمانەم دەناسین یەکەم چیرۆکم بەناوی « برسیەتی بە هێزترە » لە سەرەتای پەنجایەکان نووسیوە ، ئەم چیرۆکە لەبەرگی دووەمی چیرۆکەکانمە کە سالێك پترە دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی بەنیەتی چاپکردنی وەری گرتووە ، بەهۆی گەلاوێژ بەشێك لە ئەدەبیاتی بێگانەم بەکوردی خوێندنەوە . نووسینەکانی بلەو سەجادی ، شیعرەکانی بێکەس‌و گۆران‌و ئەسیری ، چێژی ئەدەبیان لاخۆشتر کردم‌و چارەنووسیان بەستم بەچارەنووسی ئەدەب بەتایبەتی چیرۆك .. تا گەیاندمیانە قەسرە تەلیسماویەکەی « کافکا » ماوەیەك لەناو قەسرەکەدا گەرام ، سەرم لەناو عالەمەکەی پیکێت‌و .. ئاوامۆف دەسوڕا .. خۆم لەناو غەریبی کامۆ دەدۆزیەوە .. تێکەڵاوی سوء تفاهمەکەی دەبووم ، لەقورنەیەکی دادگای کافکا شیخ مەلا عبدالقدوسی خوالێخوشبوم دیەوە ، لەویش رەشو ڕوتێکی زۆر وەك دیوار دەوریان دابوو .. کە ئەو باس عەزابی دۆزەخی دەکردو وەسفی لاشەی وەك کەباب لە شیش دراوو، ئافرەتی بە مەمك لەزارکی کورەی ئاگر هەڵواسراو ، باسی زەباتیەکانی دەکرد .. کە چاویان وەکو کورەی زەردەوالەیەو لێویان دەکەنە تەختەبەرە ددانیان وەك پێمەرەن .. ئەمانە دەستیان بەناڵەو هاوار دەکرد .. شێوەنیان دادەمەزراندو دیوارەکەیان دەهەژاند ، کە جەناوەرەکەی پێکتم ناسی ... وێنەی ئەژدیها هەشتا سەرەکەی ئەفسانەکانی رۆژهەلات و مەرجانی جادووی ئەفسانەکانی کوردیم دەهاتنەوە بەرچاو!!. بەکارتی‌کردنی ئەمانەوە چیرۆکی قوچکەو .. سەرەتاو دوایی.. پاشدانیش عاجباتی هەشتەمم نووسی ..

ئەم وێنانەم هێنانەوە ، هەر لەبەر وێکچوونیان بوو و بەس، دەنا بەبێ یەکو دوو ، پێ لەوە دەنێم کە نەم توانیوە ئەم سێ کەلە نووسەرە هەزم بکەم ..یان نەو کەم خۆراکەی لەوانم خواردووە تێری نە کردووم بروایشم بە گەرانەوە نیە بۆ عالەمی تەلیسم‌و دێوو درنج، من کە پیاوێکی ئاسایم‌و دەمەوێ شتێك بەم خەلکە بڵێم ، ئەگەر بمەوێ خەلکەکە تیم بگەن دەبێ بەزمانی ئەوانەوە بدوێم .. دەسقووری فیکری ئەوان بە یەکجاری نەسترمەوە .

کە بۆ خەلکی ئەم وولاتە دەنووسم ، دەبێ پێشەکی باری سایکۆلۆژی‌و کۆمەلایەتی ئەو خەلکە بزانم کە دەمەوێ بەهۆی چیرۆکەوە ماملەتیان لەگەلدا بکەم ، دەبێ بیر لەوە بکەمەوە چۆن گرێ‌کوێرەی هەزاران سالیان دەکەمەوەو دڕندە سندم کراوەکەی هەزاران سالەی دەروونیان کەیی‌و بەرەللا دەکەم.

هەرگیز ناتوانم وەکو نووسەرێکی رۆژ ئاوا کەبۆ خەلکی رۆژ ئاوا دەنووسێ وەکو ئەو نووسەرە بۆ خەلکی رۆژ هەلات بنووسم ، چۆن دەتوانم بە خەلك بڵێم ئەوەی باوکی خۆی بکوژێ قارەمانە ؟. هەتا لە لایەن شێوەشەوە بەلای من ئەمە راستە ، هەتا لەشێوەش .. شێوەکە ئەداتێکی گەیاندن‌خۆشتر دەکا .

مومکن نیە هەتا فرۆکەخانە لە گوندی زەلم دوروست نەکرێ بەفرۆکە لەو گوندە دابەزم . لەگەل بڕوایی پتەویشم بەوەی کە دەبێ رۆژێك بتوانم بەفرۆکە بچم بۆ ئەو گوندە .. ماوەیێکی کەم لە رۆژئاوا ببووم ، لە کۆلانەکان ، لەناو پاس ، شەمەندەفەر .. لە کازینۆکان ، لە چێشتخانەکان لە پارکەکان کوڕو کچ پەردەییەیان لە نێواندا نیە ، سێکس لەوێ مفهومێکی تایبەتی و مەعقولی هەیە ، ئەوانەی لەو جێگایانە .. لە عالەمی سێکس‌دا دەیانبینین .. رۆژانی یەکشەممە بەیەکەوە لە رێزەکانی کەنیسە دەیاندۆزیەوە !!

هەرگیز پێم وانەبووە وەپێش عەسری خۆم کەوتووم ، یان زووتر لەوادەو بەکامیلیش خولقاووم دەنا هانام دەبرد بەر ئەو جیهازەی دەلێن گیان لەبەر دەخەوێنێ یان دەیبەستم واتا تجمیدی دەکاو دەیخاتە دەوری سبات تا لەو عەسرەی بەعەسری خۆمی دەزانم بێمەوە مەیدان .

**بەرێزان :**

لەتاقی کردنەوەکانم ، ئیمان بەخاکو بە ئینسان دروشمی
یەکجاریم بوون ، بڕوایم وا بووە کە پێم لەو زەویە چەقیوون،
رەگم لەم خاکە قووڵ قووڵ داکوتاون ، گیانم دابەستەی ئەو
خاکەیە کە لەسەری دەژیم بە ئاوو هەوای نەشونما دەکەم
خۆشەویستیم بۆ ئینسان بەگشتی و بۆ ئینسانی وولاتەکەم
بەرپیەت بێ دوایە ، هەرگیز شەوازی کۆمەڵەکەم بە نموونە
نەناسیوون ، هەرگیز بڕوایم بە قارەمانی خوێ سیفەت
نەبووە لام وایە هەموو کەسەکانی چیرۆك مدام رۆڵی خۆیان بە
چاکی دەگێڕن .. هەریەکەیان قارەمانێکەو بەهەموویانەوە
ژیان دەخەنە چیرۆکەکە . ئەم ئیمانەشم کردووتە بنکەی مامڵەتم
لەگەڵ کۆمەڵدا . هەرگیز پەنام نەبردۆتە بەر دەستو لاق ماچ
کردن بۆ شێ کردنەوەی گیروگرفت، هەرگیز لەسەرەوە سەیری
خەلکم نەکردووەو ئەو حەقیقەتەم لا روون بووە کە رۆژ زۆر
لە سەرەوە ترە .

هۆگری پیا هەڵدانو ئافەرینی ساختەو دەست لە پشت
دان نەبووم . ئەمانەم بە هەڵدێرێك ژماردوون کە نووسەر
بە هۆیەوە لە خشتە دەچێو هەڵدەخلیسکێ و دەدۆڕێ یان
وەکو پەینی کیمیاوی کە بەرەکەیان وەکو ئەو شوتیانە دەبێ کە
ئیمرۆ لە بازاری هەولێر ، لە رۆخ جادەکان کۆمەڵ کراون ..
شووتی زلو بەشانو شەوکەت .. بێ تامو شام .

بەهۆی گیروگرفتو سەختی ژیانی رابردووم لــــە
گیروگرفتی ئەوانی دیکە شارەزاییم پەیدا کردووەو هوشیاری
مەسەلە گشتیەکان بوومەوە ، بێزم لە خۆپەرستو دووڕووو
ئەوانە دەبینمەوە کە دیلی گرفانو وورگیانن .

بڕوایم وایە ، ئەدەبو سیاسەت وەکوو دوو قوتبی
کارەبان پێکەوە نەبێ رووناکی نادەن .. لە پێویستیشدا ئاگر
هەڵناکەن. یاخیبوو ، لەلای من ئەو کەسەیە ئامانجێك بۆ ژیان
بەدی دەکا ، بڕوایی بەوە هاتووە کە ژیان هەرگیز ناوەستێو
هەر بەرەو گۆڕانێکی باشتر دەڕواو هەوڵ دەدا کە لـــەو
گۆڕانەدا بەشداری بکات، قاوغی ژیانی ئاسایی رۆژانەی بدڕێ.
تا عالەم لەبەر دەمیاندا ئاشکراترو شتە وردیلەکان لەبــەر
چاویاندا مەزنو گەورەتر دەبن ، بڕواییان بەوە قایمتر دەبێ
کە ژیان جوولانەوەیێکی بێ کەلك نیەو هەموو ئامانجی ئینسان

« مهرجەکان » ئەوانەی بازرگانی بەهونەر دەکەن . نووسەری
سەرراست ناتوانێ لە ئەفکارو بیروباوەری خۆی بەولاوە تەعبیر
لەشتی تر بکا ، ئەگەرنا دەبینم « وەعظ خوان » و دەچێتــە
ڕێی ئەو شاهێدە حازر بەدەستانەی کاتی خۆی لەبەر دەرگای
دادگاکان رادەوەستانو بەپێی پێویستو بەرژەوەندی تایبەت
دەستیان لە سنگیان دەوەو راستیان بەچەوت نیشان دەداو
خراپەیان دەشاردەوە یان دەیان کردە چاکە بێگومـــان من
زاڵێم ؟ هەموو ئەوە بیرو رایانەی دەرم بریون یان ئــــەو
هەڵوێستەی لێ دەوەستم .. هەر دەبێ راستو بێگرێو کەمو
کورتی بن .. نا . هەرگیز من وام نەگوتووە ، زۆر ئاسایە
ئەگەر نارێکی یان لادانی یان .. یان .. بیرو هەڵوێست
گۆڕیش لە پێر بەناو سوچی ئەو نووسینانەم هەبن ئـــــان
حالەتێکی « جێگیر » نیە ، دەشێ نووسەر لەگەڵ گۆڕانی ژیانو
تەمەنی خۆی و بانی کردنەوەی رۆژانەی ، پتر بیر بکاتەوە ،
قوولتر بیر بکاتەوە ، لەشی کردنــەوەو کۆکردنەوەو لێکدان
لێك دەرکردن .. پتر ووریایی پەیدا بکاو .. ئەنجامی پوختتر
وەدەست بهێنێ . بەلام وەکو ئەشکەوت دەنگدانەوە .. لاسایی
کردنەوە .. گوێ نەدانە پێویستی جەماوەر .. یان بوونە وەعظ
خوان و شاهیدی حازر بەدەست .. ئەمانە دوورن لـــــە
نووسەری سەرراست .

**بەرێزان :**

چیرۆکی کوردی وەکو لایێك لە ئەدەبی کوردی ، بەشیکن
لە ئەدەبو چیرۆکی عیراق ، عیراق وولاتی هەموومانە ، بـــەلام



ـگداریێکی وا له بابەت چیرۆکی کوردی پەیدا بکا .. کە بەهۆیەوە ناوو ناوەرۆکی کتێبەکەی یەکتری بگرنەوە . ئێمە هەموومان دەزانین کە پتر لە دوو دکتور ـەو دوو دکتورە کوردانە چیرۆك دەنووسن ئەوانی تریش زوربەیان بروانامەیان ـەسەر ئەدەبی کوردی وەرگرتووە .. ناچارم لێرەدا بپرسم :

ئایا بەم کردەوەی جعفر الخليلیو دکتور عبدالاله احمد و نووسەرەکانی دیکەش چیرۆکی کوردی لە عێراقیەتەکەی دەشۆرێ ، یان عێراقی بوونی ئەدەبی کوردی رەش دەبێتەوەو .. عێراقیەتی گەلی کورد لە عێراقدا دەپەرێو دەبێتە هەلمە ؟!

هەمووومان دەزانین زۆر دەقی چیرۆکی کوردی هەر لەم وڵاتەی عێراقەماندا بەهۆی رۆژنامەو گۆڤارە عێراقیەکان کراونەتە عەرەبی .. نووسەرە کوردەکانیش تا رادەیێکی باش

تەنیا خواردنو مردن نیە ، ئەم روایەش بەهێز تریان دەکا ، بەسەر ترس زاڵیان دەکاو توانای ئەوەیان پێ دەبەخشێ کە خۆشەویسترین شت تەرخانو لەپێناو ئەو ئامانجەیان بەخت بکەین .

**برایان :**

نەهێنیێك ئاشکرا ناکەم کە دەڵێم هەر بیرورایەك یان هەر ئەفکارێك کە لە چیرۆکەکانی مندا هاتوون یان هەر جوولەو کردەوەیێك کەسانی ئەو چیرۆکانە بەمرازی گەیشتنە هەڵویستێکی تایبەتی ، یان بیروڕاێیکی تایبەت دەیکەن ، ئەوانە هەمووی بیروباوەڕی خۆمن ، هەڵوێستی خۆمن ، پاش لێکدانەوەو قەناعەتێك یەکسەر یان بەزاری .. یان بە هۆی کردەوەی کەسەکان دەرم بڕیون .

بەلای منەوە ئەم ڕێڕەوە ، ڕێڕەوی راستەقینەو رەواو رەوانە ، ئەگەر نووسەر رەچاوی نەکا .. کارەکەی دەبێتە جۆرە کرێ گرتەیێك، یان دەچێتە چوار چیوەی کاری کۆسەکان

**برایانی بەرێز :**

دەگووترێ .. چیرۆك نووس شاهیدی سەردەمی خۆیەتی، بەلای منەوە ئەم ووتەیە ناتەواوە !!.. رەنگە بپرسن چۆن

ئەوەی جێگای خەفەتو داخە ئەوەیە کە نووسەرانی عراقیی « عەرەب » خۆیان لەم حەقیقەتە بواردووە !! وەکو ئەم حەقیقەتە هەر نەبێ .. ئەوها هەڵسو کەوت لەگەڵ ئەدەبو بەتایبەتی چیرۆکی کوردی دەکەن !! ئێمە هەرگیز گومان لە دڵسۆزیی ئەم برا نووسەرانە ناکەین .. بەلام ئەمە رەوایە ئەگەر لێیان بپرسین : بۆچی وا ؟! ئایا چیرۆکی کوردی چیرۆکی عیراقیش نین ؟!.

* « القصه العراقيه » دانەری جعفر الخليلی ...
* « الادب القصصی فی العراق » د. عبدالاله احمد ..
* « الروايه العراقيه وقصة الريف » باقر جواد الزجاجی ..

ئەم کتێبانەم دیوون دەیان دیراسەو رەخنەو لێکۆڵینەوەم لەسەر چیرۆکی عێراقی خوێندونەتەوە ، ئەوەی سەرم لێی سوڕماوە ئەوەیە کە چ یەکێك لەم کتێبو رەخنەو نووسینانە کە باسی چیرۆکی عێراقی دەکەن کەم و زۆر باسی چیرۆکی کوردیان نەکردووە ، جعفر الخليلی هەر چەندە لە پێشەکی کتێبەکەیدا کە باسی شێوەی چیرۆکی کۆنی عیراقی دەکا دەڵێ:

«ئەم شێوەیە تائێستاش لە گوندەکانی کورد هەر باوە».. وە ئەمە وەکو بەلگەیێکی بوونی ئەم جۆرە چیرۆکە لە عیراقدا دەهێنێتەوە !! کەچی پاش ئەم چەند دێرە تەنانەت بەیەك تاقە وشەش،لەبەشێکی گرنگی چیرۆکی عیراقی کە چیرۆکی کوردییە نادوێ !! .. « دکتور عبدالاله »یش لە کتێبە نایابەکەیدا خۆی هەتا ئەگەر بەمە ڕازی بکا داوای بەخشین لە خوێنەر بکا چونکی ئاگاداری چیرۆکی کوردی نیە ! ئەم داوای بەخشینە بەلای منەوە جێگای خۆی نیە ، چونکی دکتور ، دەیتوانی هەر لە هەڤالە کوردەکانی خۆی لە دکتورەکانی زانکۆی بەغدا

**وەرگێڕاوە .. خۆ دەیانتوانی لەو زمانە بێگانانەوە دەقە کوردیەکان وەربگێڕن .. یان لە ئەدەبو چیرۆکی کوردی ئاگاداری پەیدا بکەن .**

من بەحەقی خۆمی دەزانم کە بەمانە بڵێم : ــ

ــ بەخوا هەرچی بکەی .. لە عیراقیەتی ئێمە لە خۆشەویستی ئێمە بۆ ئەم وولاتەمان کەم نابێتەوە ، مەسەلەکەی تۆش وەکو مەسەلەی « مام ویسی » یە .. هەموو خەلکی گوندەکەی دەیان ناسی بەلام کەس رِکی لێ نابوەوە .. رەنگە بپرسن ئەم « مام وەیس »ە کێیە ؟!. « مام وەیس » یەکێکە لە کەسانی چیرۆکێکی ئەفسانەی کوردی .. دایکی خوالێخۆشبووم بۆی دەگێرامەوەو دەیگووت : « مام وەیس » لەگەڵ برا بچووکی لە خانوێکدا دەژیان ، هەموو رۆژێکی خوا لەگەل رۆژ هەلات لە دەرگای پشتەوەی حانووەکەیان دەچووە دەرێ .. تا لە گوند دوور دەکەوتەوە دەرِۆیی .. پاشان بەرێگا باریکە کە بەرەو گوند دەگەرِایەوە،یەکە یەکە بەناو کۆلانەکانی تێ دەپەری، کە خەلقی گوند لێیان دەپرسی : ــ

ــ ها .. خێرە وا .. مام وەیس !؟

مام وەیسی لە وەلامدا بە خەلقەکەی دەگووت :

ــ وەللاهی .. غەریبی برا کچکەکەم کردووە .. ئەوا دەچم سەرێکی لێ دەدەم !!..

وە بە کۆلانەکان هەلدەچوو .. تاکو لە دەرگای پێشەوە خۆی دەخزاندەوە پیرە خانوو ..

خەلکی گوندیش .. بە پێکەنین بەزەیی بە مام وەیس دەهاتەوە ، بەشەکەی تریشیان لە ناوەوە پێی پێ دەکەنین .. بەلام کەسێکیان رقی لێ هەلنە دەگرت ..



ئەمانە شاهیدی ئاسایین چۆن دەبینن وا دەیلێنەوەو لەمە پتر خۆیان ماندوو ناکەن لەوەی بەچاو دیویانە یان بەدەست گرتوویانە یان گوێ بیست بووینە زیاتر بکۆلنەوە ، بەم چەشنە خوای خۆیان رازی دەکەن ، ئیتر کاریان بەسەر ئەوەدا نیە کە بیر لە رەگوو ریشەی رووداو بکەنەوە یان لە دوافعی بکۆلنەوە ، هەتا وەکو ئینسانێك هەلوێستێکی بۆ وەرگرێو بەپێی ئەو هەلوێستە بجوولێتەوە .. ئەم شاهیدانە ناتوانن خۆیان لە کویلەتی پێنج حەواسەکەیان ئازاد بکەن و هەرگیز چاویان لە خۆلەکەی بەر پێی خۆیان بەرزتر ناکەنەوەو لەو بستە زەویە پتر نابێنن کە وەکو دەلێن بارگیری گالیسکە دەیبینێ !!.

بەلای من ئەم جۆرە چیرۆکنووسە شاهیدانە یان شاهیدە چیرۆك نووسانە ، دەکەونە رێزی چیرۆك نووسە قۆپیەچیەکانو لە روانگەیێکی تەسك خۆیان مات کردووەو راوی رووداو دەکەن و هەرگیز خۆیان بە بەشێك لە رووداوەکە دانەناوەو نەیان ویستووەنەیان توانیووە لەمەندە پتر لەمەسەلەکە نزیك بکەونەوە کە جازبیەتی رووداو بیانکێشێو تووشی سەر ئێشە ببن .

شاهیدیش هەن .. پێیان دەلێن شاهیدی حازر بەدەست ! لە سەرەتای چلەکان لە ناوەندی هەولێر دەم خوێند ، باسی ئەو شاهیدانەیان دەکرد کە لەبەر دەرگای هەولێر رادەوەستان ، یان لە خزمەت ئاغایەکان دەهاتنە رادگاو بۆ چەند دینارێك یان بۆ رازی کردنی ئاغا، لەپێش حاکم

توانیوبانە ئەدەبی کوردی بەگشتی بەبرا عەرەبەکانمان بناسێنن. لام وایە . ئەوەی بیەوێ ئاگاداری لەم بابەتەوە پەیدا بکا دەتوانێ بگەرێتەوە سەر ئەو دەقانە و کەلکیشیان لێوەرگرێ، کاکە ئەمەیش نا .. خۆ ئەم زاتانە ئەگەر زمانی کوردی برا بچوکیشیان نازانن .. لە زمانەکانی بێگانەوە شارەزان بە بەلگەی ئەدەبی لە هەموو زمانەکانی گەلەکانی دونیا لەهەر پێنج کێشوەر ئەدەبو چیرۆکیان کردووتە عارەبی « ئەو بێگانانەش تەواوێك چیرۆکو دەقی ئەدەبی کوردیان بۆ زمانی خۆیان



بەراستگۆیی‌و ئەمینی بەشێك لە تاقی كردنەوەكانی ئەدەبی
خۆم بەئێوەی هێژا گەیاند .. هیوادارم كە لەدوا ڕۆژیش وەكوو
نووسەرێك دەكرێم بە شاهیدی ئەم ڕۆژانەمان ، ئەو شاهیدە
حازر بەدەستە نەبووبم ، كە دەست لەسینگ وەستاوەو
ئارەزووی ئەوانی دی دەهێنێتە دی ، هەروا ئەو شاهیدە
ئاسایەش كەمێش دەچنە كونە لووتی ئەوجا سەری
دەلەقێنێ ، بەشكەم ئەو شاهیدە بووبم كە لەمەسەلەكەی
گەلەكەی لەمەسەلەی ئینسان خۆی بەپەیوەندی دارو « ذوی
العلاقە » دەناسێ و بە هۆشیاری شت لێك جودا دەكاتەوەو
تەواناى ئەوەی هەیە ، بەرەش بلێ ڕەش‌و بەسپیس بلێ سپی
.. ئیتر هەربژین ..

ـەی ناتەواو بێ ؟! جارێ بابزانین شاهید كێیە ؟! وە بەیوەندی
شاهیدێك جە قەزیەیێكی دیاری كراو چیە ؟! ئایا شاهید
ەسێكە لە قضیە كە ؟! یان ئایا شاهید پەیوەندیدارێكە . وا
ە ذوی العلاقە » دەژمێردرێ ؟ بێ گومان نا ؟.. تەنانەت لە
لایەنی ئاسایەكەیشەوە شاهید پەیوەنداری هیچ قضیەیەك
یە . پیاوێكی لاتەریكە . لە ڕۆخی مەسەلەكە ڕادەوەستێ ..
ەی كەواتە چیرۆك نو ـ چۆن دەبێتە شاهید ؟! بابلێین مرۆ
خۆی بەوە ئیقناع بكا چیرۆك نووس جۆرە شاهیدێك بێ ..
ە چەشنێك بە شاهید بچێ ، بەلام كام شاهید ؟! شاهید هە
.. ناویان بند. شاهیدی كلاسیكی . ئەم شاهیدانە كە خەلك

بەزۆری دەیان بینن‌و دەیان ناسن .. ئەوانەن كە شتێك
دەبینن ڕەق دەبگێرنەوە . یان تۆماری دەكەن . واتا لێرە دا
چاو ئەندامی سەرەكییانە لە گەیاندنی شاهیدیەكەیان .. بـا
دەستو قەلەمیش دەورێكیان هەبێ لە چەسپاندنی ئەو چـاو
دیدەیە لەسەر لاپەڕەیێك یان لەسەر تەلیشە بەردێك یـان لە
ماددەیێك دابڕێژێ یان بەرەنگ عەكس بكاتەوە . بەلای منەوە
ئەم بابەتە شاهیدە فرمانی هونەرمەندی ڕاستەقینە ناگەیەنێ.
دەستیان لە كتێبە پیرۆزەكە دەدا .. ئەم شاهیدانە بەچاویش
شتیان نەدیبوو ، تەنانەت حەواسی خەمسەشیان نەجولابوەوە
.. بەلام بەپێی بەرژەوەندو لەپێناو ڕازی كردنی ئەوانی تـر
دەجوولانەوە ! بێ ئەوەی بیر لەوە بكەنەوە كە ئەم كردەوەیان
مافی خەلكی بێ تاوان بەفیرۆ دەدات .. ڕەنگە ژیانیشـیان
بخاتە مەترسی !!

شاهیدیش هەن .. لەڕاستی لانادەن ، هوشیاری ئەوەیان هەیە كە ئادەمیزاد هەر تەنیا چاوو پێستو زمانو لووتو گوێچكە نیە ، بڕوایان بەوە هەیە كە هەریەكێك لەو حەواسانە ، چەند شانەیەكن لە ملیونەها شانەی بنیاوی ئینسانی لێ پێك هاتووە ، ئەوانە دەزانن كە ئینسان زۆر لەو پێنج ئەندامە زۆرترە ،.

ئەم شاهیدە ئەو حەقیقەتەی دەیلێ .. حەقیقەتی خۆیەتی لاتەریك لەمەسەلەكە ڕانامێنێ ، خۆی بەبەشێك لەمەسەلەكە دەژمێرێ ، بگرە زۆر جار ، تەنانەت خۆیشی بە دوروستكەرو هۆی ڕووداوەكە دەزانێ .

ئەم شاهیدە ، هەلوێستی تایبەتی خۆی هەیە . لەبەر ڕووناكی ئەو هەلوێستەی ، بەهەموو هوشیاریەوە شاهیدیەكەی دەداو ئەو ڕاستیە دەچەسپێنێ كە چیرۆك نووس نەك تەنیا شاهیدە بەشكەم بەشداری ڕووداوی سەردەمی خۆیەتی‌و دەستی لەدوروستكردنی عالەمەكەی خۆیدا هەیە ..

**برادەرانی عەزیز :**

ئادەمیزاد لە غزێكە كلیلی شی كردنەوەی لە گەرووی حوتەكانی دەریا دایە ئەشكەوتێكە دەنگی سەدەكان دووبارە دەكاتەوە ، ئاسمانێكە بێ‌دوایی ، چیرۆك نووسیش ئادەمزادە هەر چەند بكۆشێ ناتوانی بەتەواوی خۆی بە عالەم بناسێنێ ، دەلێم نەتیوانیوە تەنانەت خۆی بەخۆی بناسێنێ !! لێرەشدا تەنیا دلم بەوە خۆش دەكەم كە لەم چەند دێرانەی خوێندمەوە بەراستگۆیی‌و ئەمینی بەشێك لە تاقی كردنەوەكانی ئەدەبی خۆم بەئێوەی هێژا گەیاند .. هیوادارم كە لەدوا ڕۆژیش وەكوو نووسەرێك دەكرێم بە شاهیدی ئەم ڕۆژانەمان ، ئەو شاهیدە حازر بەدەستە نەبووبم ، كە دەست لەسینگ وەستاوەو ئارەزووی ئەوانی دی دەهێنێتە دی ، هەروا ئەو شاهیدە ئاسایەش كەمێش دەچنە كونە لووتی ئەوجا سەری دەلەقێنێ ، بەشكەم ئەو شاهیدە بووبم كە لەمەسەلەكەی گەلەكەی لەمەسەلەی ئینسان خۆی بەپەیوەندی دارو « ذوی العلاقە » دەناسێ و بە هۆشیاری شت لێك جودا دەكاتەوەو تەواناى ئەوەی هەیە ، بەرەش بلێ ڕەش‌و بەسپیس بلێ سپی .. ئیتر هەربژین ..

دیوانی کاروان

# شیعروەی


**جەلال مەدحەت خۆشناو**

**هەولێر ٢٦ـ١٠ـ١٩٨٠**


ویستم مەستبم . . .
هەتا چیدیکە نەبینم
بووك جلی خۆی بنێتە خەم
هەتا چیدی ئاخ نەچێنم
کەسەر و خەم نەگرویَنم !
ویستم مەستبم . . . .
هەتا چیدی هاوارە ڕۆ
نەیکەم بە بەڵگەو و بەهۆ
بۆ چارە سەری ژانی سۆ !
هەتا چیدیکە بەسەرهات
نەڕوانە ڕێی هات و نەهات !
ویستم مەستبم . . . .
هەتا چیدیکە هەست نەکەم
بیری شێواو دەربەست نەکەم
ناحەز داسی بسوێتەوە
خۆشی من بدروێتەوە
گۆڕی خەرمانی خەفەتبم
ویستم مەستبم . . . .
پەنام بردە مەیخانەیێك
چەند جۆرە شەرابی هەبوو
هەمووم نۆشی بەك دوای یێك
ئەوەی من دەمەویست نەبوو !
بانگی مەی گێرم کرد . . . وەرە
هات و فەرمووی کاکە چی‌یە ؟
پێم ووت شەرابتان چاك نی‌یە
مەستی ناخاتە ئەو سەرە

دەمەوێ شەرابێکی تیر
ژەنگ ڕامالێ لە ژیر و بیر
برینم چیدی نەکولێتەوە
خەم هێلانەی نەنێتەوە
بەهەناسەی پڕ لەبریا
مەی‌گێر لە وەلاما گریا : ـ
ئەو شەرابەی تۆ دەتەوێ
بەداخەوە . . . .
لەو مەیخانە دەست ناکەوێ !
دەموێ مەستبم . . .
کاکە چارە
خۆ دەردم ئاشکرا و دیارە
ووتی کاکە گەلێك کەس هەن
گیرۆدەی ئێشی ئەو دەردەن
وەك‌تۆ پەنا بۆ مەی ئەبەن
چونکە دڵسوزی نەتەوەن !
بە گەڕیدەی ئەو ئەرزە
هەروە ئەو خاکەی پڕ ڕەزە
بەلکو لەوێ
ئەو شەرابەی تۆ دەتەوێ
دەست بکەوێ !
دەم ویست مەست بم . . .
بۆیێ کەوتمە گفت و ڕاوێژ
گەڕیدەی ڕێی دوور و درێژ
گەڕام ، گەڕام . . . .
بەدوای ڕەزی ترێ سووڕام


تێبینی: بڕۆنە ڕووپەری (٢٤) بۆ پاشماوەی شیعرەکە .

# لیزەخان

محمد صدیق محمود

تۆ ئەزانی
پەڕەکانی ڕۆژ ژمێری
ئەو کاتانەی تۆم تیـا ئەوێ
ئێستاش ماومە
چرکە نیە لەدیدەنیت لەبیر چوبێت
یەکە یەکە لەنیوان پەڕاوی دڵمـا
تۆمار بوەو هەر تەنیابم
ئامادەنو لەبەر چاومە
بڕوا بکە ئـەی پەرستگام
هەر دەروێشەکەی جـارانم
ئێستاش شەیدام
هەر یادێکت کە میوانی هەستم ئەبێت
یا ناوت دێت
خۆشاعیرنیم بۆت بنووسم
چیم بەسەردێت !!

خاتو لیزە بەڵام چی‌بکەم
تۆ لەو دوورەی
منیش لێرەم
توێشەبەرەی پـڕ یادتـانم
لەدەوری دڵم بەسـتووە
هەر یادێکتان هەزار ڕستم بۆ ڕسـتووە
هۆ لیزەخـان
تاکو ئێستاش هەر بێ‌ئاگان
کەتۆم ئـەدی
چاوەکانم خۆشەویستیان ئەورکان
من هەژار بووم
تۆش بایەخدار .
نەوێرام بڵێم بەزمان
خۆشم ئەوێیت
ئەگەر نیگای ئێستات وایە
جاباشە تۆ بۆ نەت‌درکان

هەی بێ‌بەڵابیت لیزەخان

ئەی لیزەخان
تۆ ئەزانی جار جار
دڵ بەچی خۆش ئەکەم
ئەڵێم چاکتر نەبووینە هاوسەرو هاودەم
نەوەك جارێك
ووشەیەکم ،
هەڵوێستێکم
بەئاستەم زیزی کردایە
دڵی گەردی بگرتایە
جا ئەوکاتە چیم کردایە ؟

ئەی لیزەخان
ئەگەر ڕێکەوت بو لەمەودوا
هەر هەردووکمان
بەیەکتر گەیشتین وەکو جاران
ئەگەر مەودای بو تەمەنمان
ساڵێکی تر
دە ساڵی تـر
بیست ساڵی تـر
چەندە پیربین ئینجا چاکتر
ئەگەر ڕێکەوت بەیەك بگەین
ئەم ئاواتەم بهێنەدی
کاتێکی کەم
بوار بدە دەست لەمل کەین
دەم ئەهێنم بۆ ڕومەتت
نەڵێیت نەکەی ؟
تاهێزم تیـا بێت ئەتگوشم
ماچت ئەکەم
تا لەناخا ئەڵێم ئۆخەی

هەندەم ڕێچکـەی سەخت بڕین
لەنـاو چقل و دڕك و داران
تـا پێم خـاران ،
گەیشتمە ئاقاری سـەفین
هەر لەوێوەدا مامـەوە
لەسـەر تاتی ڕۆخ ئاوەزێ
لەو بەر تەلان بەدیار ڕەزێ
حەسـامەوە ....
پاش ماوەیێك
کەوتمە گفت و گۆی کابرایێك
ووتم کاکە ، مامە خۆشـناو
گرێیکم بـەربودتە هەنـاو
دەموێ مەسـتبم ....
خۆ لـە بیرکەم
خۆ لەچەرخی نەمان گیرکەم
ئەڵێن دەرمانی دەردی تـۆ
لە گەنجینـەی پاشاو میردا
کەس نایگاتێ !
بزن شیردا لۆ داپیردا

داپیر کلکە قولەی وەدا
بگەڕێوە شوێن هاتی خۆ
خوابتدانێ !
دەموێ مەست بم ....
بۆیێ ڕووم کردە ئێرانە
بەلکو ئێرە بەدەرمانە
بیستومە ئێـرە ناودارە
پێیـان ووتووم ئەو ئاقارە
پڕڕەزی تـرێ و بەیارە
بۆیێ هاتووم ، بەلکو تـرێ

بکەمە مێوژ ـ شـەڕاب بگرێ
تـا ئێشی دەردم لا بەرێ !
ووتی ڕۆلە ـ کاکی ڕێبوار
سـوار نەپەڕێ نابێ بەسوار !
ناوداری چی ـ ئاقاری چی
ڕەزی ترێ و بەیاری چی
لـە مێژە ڕەز بەردراون !
جۆگە و کانی دەردراون !
قـسەت بەهی شـاعیر دەچێ
شـاعیر بەچاك و پیر دەچێ
ئیمەش گیرۆدەی بەسـتینە
ئێمـەش تامەزرۆی مەستینە
هەسـنە کاکە ....

مشـتافی دلـسۆزی ڕاکـە
مـەلی شـیعرت بەرەللاکـە
لە جیـاتی تـرێ و بەلەچەك
خامـەی شـیعرت بکە بەچەك
شیعرێکمان بۆ بنووسە خۆش
بۆ کوڕی مەستی و بادە نۆش
بەلکو مرۆڤ کاتی مەسـتی
دەرد و ئێشی خۆی لا بەرێ
بیری بڕوا بۆ سـەربەستی
پڵنگ لـە لانە ڕا پـەڕێ !
ئەڵێن مرۆڤ بە سـەرخۆشی
داناترە !
ئەڵێن مرۆڤ بەبێ هۆشـی
ئـازا تـرە !
چونکە تـا هەست بەئێش نەکەی
حەزت ناچێتـە شیعر و مەی

تا مەست نەبی
دەربەست نابی
تا پەست نەبی
پڕ هەست نابی
کەتۆ دلسۆزی ئەو دایکەی
پەروەردەی ئەو ئاو و خاکەی
دەبێ پیشەت تێکۆشان بێ
هەول و کارت بێ ووچان بێ
لە هێرش و هەلمەت بردن
بۆ نیشتمان ئاوا کردن
هەموو بچینە ڕێی مردن !
لەو کاتەوە . . . .
بەلێنم داو گەڕامەوە
چەند زەمانە
خەریکی شیعر نووسینم
خەریکی ووشە چنینم
وەکو مەملەکەتی مێش هەنگ
شیعرم بوەتە دەنگ و ڕەنگ
لە هەر گولێ پێێ ئەمژم
لەهەر چاوێ خوناو ئەڕژم
شنەی بەیانم چنیوە
لەنجەی شاتانم ڕنیوە
نەغمەی شالوورم گرتوە
تەقەم لە گەردوون کردوە
بانگی کەلەشێری بەیان
متوربەم کردوە لەحەیران
بۆ کوردستان !

زۆر ووشەی شیعرم ڕستوە
زۆر هۆنراوەم ڕێك خستوە
چەند زەمانە خەریك شیعرم
بەلآم هێشتا لەسەرە تام
لەوانەیە من دەشمرم
ئەو شیعردم ناگاتە مەرام !
ئەوشیعردم ناگا بە مەرام !!!

خم : ڕەنگاوی ڕەش
گرواندن : خاراندن
سۆ : لولکی ژوورەوە
کولانەوە : ئێش کردنەوەی زام
بریا : خۆزگە
تات : بەردەپانی نوێژ لە سەرکردن
تەلان : لێژایی هەرد
میر : ئاغا
بەیار : ڕەزی ترێ
بەلەچەك : مێوەی رسکاوی ناو دۆشاو

شیعری: جەلال مەحمەد خۆشناو
هەولێر ٢٦ - ١٠ - ١٩٨٠

دیوانی کاروان

# ئەی کچی وولاتی بەفر

فەرەیدون عەبدول بەرزنجی

ئەمشەو خەوم پێتەوەدی
لەخەوما بوو بووی بەپەری
وەك فریشتەی بەرگ سپی
دەهاتیتە خوار بەکپی

پەریزادە
ئەی دەمو چاو فریشتەیی
ساڵێك ڕۆیی
هەواڵێکم پێ نەگەیی

کەی دێیتەوە
واوەرزێکی گەورەو گران
بەسەر دووریتا تێ پەڕی
پاییز هاتو گەڵا وەری
ئەی کچی وولاتی بەفر
من ئامادەم بۆ کچێکی وەك تۆ پەری
هەوار هەوار
شوێن پێی کاروانت هەڵگرم
ببم بەکوڕە کۆچەری

هەر دێیتەوەو کەدێیتەوە
تۆ ڕاهاتووی ئاوو هەوای ئەم کوێستانەی
تۆ کچی وولاتی بەفری
بێگومانم ئێستا دەجاران جوانتری

سلێمانی ــ زستانی ١٩٨٢

# رازی «وەرە» کانم ...!

مدحت بێخەو
٢٠ــ١٢ــ١٩٨١

· بەڵێ ڕەوتی هەورازی ڕێ
زریان و تۆف دەیهەژێنی
ئەمەنیش وەك قەراخ ڕوبار
دەخورێ و شەپۆڵ دەیفرێنێ
بەلام ورەی دڵداری خاك
لە بنیاتی کێوی بێتوون

لەشیعرە کۆنەکانی گریك




* نووسینی : ئیبیکۆس ــ
* سەردار میران
لە ئەڵمانیەوە کردوویە بەکوردی

... هەر لە ڕۆژانی مانگی بەهاردا
« بێ » یەکان شین دەبنەوەو ،
لە ئاوی ڕوبار دەخونەوە .

ەهێــز تــرە و ...

ۆ ســـەر بەرزیش

ئەڤریــست » کڕنۆشی بۆ دێنێ .!

* ■ *

ە شــەوی تار دیدەکان نابینـــا دەبن

ـرمایی‌یەکان ســـام دەچێنن

ەرگای روانگەکان دا دەخرێن

ڕندەکان ســـەر دەردێنن

ەچوار لاوە گەرداوەکان چرای بەرزی

ەندرەکان دەکوژێننـــەوە

ەلام. ئەنجـــام ..

تیشکی بیری بیدارەکان

خێڵی تاریکی رووی زەوی دەبەزێنن

* ■ *

ماتماتیکی داگیرکەران

فێڵ لە بازوەکان دەکەن

وەکو ژووژك

سەریان لە لەش حەشار دەدەن .

بەلام بیر و ماسوولکەکان

هەتا دێن هەر بەهێز دەبن

فێڵبازەکان ریـــوا دەکەن .!

**هەنارەکانی باخچـــەی کیژۆلەکانیش**

**وەك پشکۆی(1) تـری ،**

**لەژێر ســـیبەری چووزەرەکانی دارمێودا ،**

**بەشەرمەوە دەر دەکەون .**

* ■ *

بەراستی ئازاری خۆشەویستی

هیـــچ نایەوێت لەناو دڵدا بنوێ

نەلەزستاندا ، نەلەهاویندا ..

**لەخواوەندەوە ،**

**لە (( ئەفرۆدێت )) ە وە بۆم ناردراوە ،**

**وەك برووسکە ،**

**وەك گەردەلوولی باکوور ،**

**بەرووشکی ، بەتاریکی ، بەشەیدایی**

**دەچێتە دەروونمەوە ..**

---

* **ئیبیکۆس** : لە ساڵی ( ٥٥٠ پ . ز ) لـــە خوارووی وولاتی ئیتالیادا لە دایك بووە ، یەکێکە لـــە شـــاعیرە گەورەکانی گریك ، بەهۆنراوەی غەزەل و گۆرانیی خۆشەویستی ناوبانگی دەرکردووە .

**(1) پشکۆ** = چرۆ ..

**سەرچاوە** :

Lyrik des Abendland
Band 1
Deutscher Tasehenbuch Verlag

# لە ئاسۆی چاوەڕوانیدا

مستەفا ساڵح کریم

**چی‌تر ئارامی نەگرت لە ناو ئوتومویلەکەیا بمێنێتەوە ، دابەزی ، بەبەر نەخۆشخانەکەدا کەوتە هاتو چۆ « سەیرە ، تو خوا ئەمە شوێنی بەیەك گەیشتنی دڵدارانە » قیژەی منالانو ژاوە ژاوی ئوتوموبیل لە کاسەی سەریا پوورە هەنگێك بوو گیزە گیزی ئەهات ، تاو تاوەش سەیری سەعاتەکەی دەستی ئەکردو لە دڵی خۆیا ئەیوت « ئەوەندەی نەماوە پێك بگەین ، هەر ئێستا یان تاوێکی تر بەخۆیو زەردە خەنە ناسکەکەی سەر لێوەکانیەوە دەر ئەکەوێ » .**

کات بوە گوێزانێکی تیژو بەسەر لەشی ئارامیا هات ، بەخۆیو تەوە « تۆ بڵێی نەیەت ؟! بڕوا ناکەم ! ئەی هەفتەی پێشوو ، وەك هەموو جارانی تر لە کاتی خۆیدا نەگەیشت ! »

بێ ئارامی بوە ئەسپێکی سەرکێشو هەڵیگرت ، جارێکی کەش سەیری سەعاتەکەی کردەوە « دوازدە و نیوە ، دەبوو لە دوازدەدا لێرە بوایە ، خۆی ئەم شوێنەی دەست نیشان کرد » ڕووی لە تەلەفۆنی گشتی نەخۆشخانە کە کرد ، کەوتە پشکنینی گیرفانەکانی ، دەفلسیەکی بەدەستەوە نەهات ، چوە دەرێ تا شتێ پارە ورد بکاتەوە ، لە پڕ ناسیاوێکی کۆنی بینی کە دەمێك بوو لێك دابڕابوون ، ئەم خوا خوای بوو لە کورتی بیبڕێتەوە ، بەڵام ئەو دیار بوو زۆری پێ‌بوو ، هەر چۆنێ بوو داوای دەفلسیەکی لێ کردو لێی جیا بوەوە ، بە پەلە خستیە ناو کونی تەلەفۆنەکەوە ، نمرەی تەلەفۆنی شوێن کاری [ سەناریا ] ی بادا ، جگە لە زەنگی تەلەفۆنەکە نەبێ هیچی تری بەر گوێ نەکەوت ، دڵی کەوتە پەلە کردن ، ماوەیەکی باش گوێی بۆ لێدانی زەنگی تەلەفۆنەکە شل‌کرد ، کەس هەڵی نەگرت .

« بۆ نەهات ؟ چی ڕووی‌دا بێ ؟ نەبێ لێم زویر بووبێ ! خۆ هەفتەی رابوردوو شتێکی وام نەکردوە بووبێتە هۆی زیز بوونی، بە پێچەوانەوە زۆر بەختیار بووین ئەی بۆ دیار نەبوو؟!» .

بەر دەرگای نەخۆشخانە تا ئەهات ژاوە ژاوی زیاتر ئەبوو ، تاکسیەکانیش یەك بەدوای یەکا خەڵکیان دا ئەبەزاندو خەڵکی تریان سوار ئەکرد ، ئەمیش چاوی بڕیبوە شەقامەکە . «هەفتەی پێشوو ، نیو سەعات بەر لە ئێستا ، پاسە سوورەکە ئا لێرەداوەستا ، چاوم لە دەرگای دابەزینی نەئەتروکاند ، پۆل پۆل خەڵکی هەڵرشتە سەر شەقامو شۆستەکە ، ئەوەندەی پێ‌نەچوو بلوزە پەمەیەکەیم بەدی کرد ، باڵایەکی بەرز ، گەردنی سپی بێگەرد ، دوو چاوی گەشی رەشی مەیلەو قاوەیی، جووتێ برۆی جوان وەك مانگی یەك شەوە تیشکی جوانی‌یان بەسەریانا ئەپرژاند ، بەپیریەوە چووم ، دەستم خستە ناو دەستی ، ئەمەویست لە بەر چاوی ئەو هەموو خەڵکە دەم بخەمە ناو دەمی‌و تێر لێوەکانی بمژم ، بەرەو لای ئوتوموبیلەکە ڕۆیشتین ، لێلێم پرسی :

— بەرنامەی ئەمڕۆمان چۆنەو بەرەو کوێ بچین ؟

بە زەردە خەنەیەکەوە کە هەر لە خۆی دێ لە گەڵ برۆ جولاندنێکا وتی :

— لەپێشا ئەچین بۆ پیشانگای گوڵ ، بەدرێژایی ئەم هەفتەیە ئاواتم ئەوە بوو بیبینین ، ئەترسام کاتی بەسەربچێ‌و فریای نەکەوین » .

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا ، سەیرێکی ئەم بەر و ئەو بەری شەقامەکەی کرد ، چاوەکانی بڕیە دوور تریش ، پاڵی بە درەختێکەوە دا « هەفتەی رابوردوو لە ژێر درەختێکی وا سەوزو جوانابوو دیاریەکەم دایە ، دیمەنی گوڵە ڕەنگاو ڕەنگە ڕازاوەکانی پیشانگاکە هەستیان وروژاندبوم هەر چوار لامان گوڵ‌و سەرەوەشمان بەگەڵاو گوڵ تەنرا بوو ، ئەتوت کەژاوەیەو ڕامان ئەژەنێ ، لەگەڵ بۆنی خۆشی گوڵەکانا گڕی هەناسەی

هەردوکمان تێکەڵ بەیەك بوو ، زۆرم خۆش ئەوێ ، لە توانامـا
بماوە بیشارمەوە . . . ئەی ئێستا ! بۆ ووشە لە سەر زمـانم
وشکایی هاتوە ؟ بۆ دەرناکەوێ تا گەرووی تاساوم بەربێ ؟ »
بەسەرێتی بیرەوەریەکانی ڕۆژانی ڕابوردوو ، وازیان لێ ئەهێنا ،
بەتوانای ئەوەشی هەبوو ئەو شوێنە بەجێ بهێڵێ ، ساتە نـە
ساتێ ئەیوت « هەر دێت ، ئەم ڕۆ پێنج شەممەیە ، ئەو کاتەیە
کە بەسەعاتو دەقیقە چاوەڕوانی ئەکەین و هەر لە بەیانیەوە
خۆمان بۆ پێشوازیی ئامادە ئەکەین » .

چاوی بەکچێك کەوت ، دڵی ڕاچڵەکی ، کچـە بەزەردە
خەنە یەکەوە سڵاوی لێ کرد ، فەرمانبەرێك بوو لە هۆڵی پیشانگا
هونەریەکان ، لە ئەنجامی هاتو چۆیا بۆ ئەو هۆڵە ببونە ناسیاو
، سەناریاشم لەو هۆڵەدا بۆ یەکەم جار ناسی ، لە کاتێکدا ئەتوت
بە هێنایە بەرامبەر تابلۆیەك وەستا بوو ،زۆر بەپەرۆشو تاسەوە
بۆی ورد ئەبوەوە ، منیش چاوم لە نێوان تابلۆکەو ملوانکەکەی
مسێ لە هاتو چۆدا بوو ، سنگو یەخەی کرابوەوە ، بەخەیلیم بەو
نە چکۆلە زێڕە ئەبرد کە لە نێوان مەمکەکانیا جۆلانەی ئەکرد ،
پێش ئەوەی بێمەوە سەر خۆم ئـەوە ندەم زانی هونەرمەندی
خاوەن تابلۆکە لە نێوانمانایە ، بەر لەوەی شتێکمان دەربارەی
بۆ روون بکاتەوە ، پێکی ناسین ، چونکە وا دیار بوو ، هـەر
وەك هاوڕێی من بوو ، ناسیاوی ئەویش بوو ، سەرەتای ڕێگای
خۆشەویستیمان لە وێوە دەستی پێ کرد . . . لـەو کاتـەوە
پەنجەکانی لە ناو دەستما بۆ ساتێ سەرخەویان شکاند ، بوو بە
خەیاڵی شەوو ڕۆژم ، هەر چەندە چاو ئەنووقێنم شـێوەی
شیرینی لەبەر چاومە ، کە چاو ئەکەمەوە وا ئەزانم لەگـەڵما
ئەدوێ » .

سەناریا گوڵێك بوو تازە ئەگەشایەوە ، ناوی خۆی بـە
خۆیەوە بوو ، شەیدای گوڵو جوانی بوو ، بە دەگمەن گوڵ لێی
جیا ئەبوەوە ، یان لە بەرۆکی ئەدا ، یان لە پەرچـەمی ، زۆر
جاریش بەدەستیەوە ئەگرت ، هەر چەند گوڵی بە دەستەوە
بوایە ، ئەمەیان بۆ ئەم بوو ، کە بەیەك ئەگەیشتن ئەیدایـە
دەستیو ئەیوت :

— زۆر جوانە ، شایانی تۆیە .

« ئەی ئەمڕۆ بۆ گوڵ نابینم ، نە گوڵ دیارەو نەخـاوەنی !
ئەوەك هەفتەی پێشوو کاتم لەناو هەزاران گوڵا بەسەر ببەم ، نە
ئاواش بۆ تاقە گوڵێك داماوم » .

کەوتە گێژاوی بیرکردنەوەوە ، پاڵی بەیەکێ لە ئۆتۆمۆبیلەکانی
گۆڕە پانی بەر نەخۆشخانەکەوە دا ، لێکی ئەدایەوە و سـێو
دووی دڵی خۆی ئەکرد « تۆبڵێیت ، منیش بەیەکێ لەو دڕندانە
تێگەیشتبێ کە هەمیشە دەوری ئەدەنو ئەیانەوێ کەلبەیان لـە
شلکەی لا ڕانی گیر کەن ؟ نەء ، نابێ وابێ ، چونکە وا بـۆ
شەش مانگ ئەچێ ئێمە هاوڕێینو لە یەکتر شـارەزاین ،
هەرگیز نابێ وا بیر بکاتەوە » .

یەکەم ژوانیان شوێنێکی تربوو ، گوێ ئاوو سەوزایی
بوو ، لە خەمو پەژارەی ئەوەدا بوو ئاخۆ بێت یان نەء ؟ خەیاڵی
وەك پەپوولە پاییزە کەوتبوە جۆلانە ، لە ناکاوا بۆنێکی زۆرخۆش
بەر لووتی کەوت ، وەك لە خەونێکی خۆش ڕاپەڕێ سـەری
بەرزکردەوە ( سەناریا ) بوو ، کراسێکی ئەرخەوانی لە بەرابوو ،
جانتاکەی دەستیشی هەمان ڕەنگی هـەبوو ، گوڵـەوە
نەوشەیەکیشی لە سەر سنگو بەرۆکی چەسپاندبوو کە جـار
جارە چاو شارکێی لەگەڵ مەمکەکانیا ئەکرد ، لە خۆشیانا بـۆ
ساتێ بێ دەنگ بوو چاویان بڕیە یەکتر ، چریەی سـێبەری
درەختەکان بوونە مۆسیقای چایکوفسکی ، گێژە لوکە ناو بەناوە
کەش بوو بە شەماڵ بەدەم پیاسە کردنەوە پێی ووت :

— یەکەم جارە ، هەست ئەکەم بەڕاستی یەکێکم خۆش بوێ ، چونکە ئەوەندەم شت دیوە بڕوام بەخۆشەویستی لاوازە .

— ئەشێ بەهۆی کچانی دەوروو پشتتەوە بێ :

— بۆ هەر کچان ؟ ئەشێ بەهۆی هەردوو لاوە بێ .

— تۆ لە شوێنی کارکردنتا حەساوەیت ؟

— نەء ، هەرگیز نەء !

— بۆچی ؟

— لە ڕاستیدا من زۆر حەز لە ئیشەکەم ئەکەم ، بەڵام ئەوانەی لە گەڵیانا کار ئەکەم وایان لێ کردووم ، بێز لە ئیشو لە هەموو شتێکی شوێنەکەش بکەمەوە . . چاریشم نیـە ! کچانی دەورو بەرم زوربەیان ( غادە السمان )و تـەنی « تانانەت ڕۆژ نامەش بەکەوچكو چەتاڵ ئەخوێننـەوە ، لەکاتی نوستنیشا دەسکێش لە دەست ئەکەن » .

— ئەی ڕادەی روناکبیریان ؟

— کلۆلیەکە لەمە یانایە ، فڕیان بەسەر هیچەوە نیە جگە لـە ئارایشو باسی ئەمو ئەو نەبێ .

— بابێینە سەر ئەو پیاوانەی لەگەڵتان ، ئاخۆ ڕات بەرامبەر بەوان چۆن بێ ؟

— بە دەگمەن ڕێ ئەکەوێ کچێك یەکێکیان هـەڵبژێرێو بەهاوڕێیان بزانێ !

— بۆچی ؟

— من با دوور نەڕۆم ، باسی خۆم بکەم، لەبەر دەست کورتیو نەدارایی هەر لەیەکەم ساڵی زانستگامەوە لەم شوێنەی ئێستاما دامەزرام ، دووساڵیشە کولیجم تەواو کردوە ، واتە شەش ساڵە من ئەمانەی ئێستاو ئەوانەی لـەوەو

پێشیشیان تاو توو ئەکەمو هەڵیان ئەسەنگێنم .

— تەرازووەکەت چی بۆ دەرخستووی ؟

— هەیانە ، خۆی بەشێوەیە نزیك ئەکاتەوە ، واتێ ئەگەی بەو هەمو وشە ڕازاوانەیەوە فریشتەیە ، بەڵام ئەوەندەی پێ ناچێ پێستی مرۆڤایەتیەکەی لەبەر دا ئەماڵرێو لە پێستی گورگێکدا دەر ئەکەوێ ... ئەمجا کە بۆی دەر ئەکەوێ گۆشتی بەرخەکەی بەرامبەری بۆ خواردن دەست نادات ، ئەڕشێتەوە ، چی شتی ناشیرین لە فەرهەنگە بازاڕیە شارراوەکەیا هەیە ئەیخاتە پارسەنگی ئەو کەسەوە.

— سەیرە !

— لەوەش سەیرتر ، خۆی باسی هونەرو جوانیو سەربەستیت بۆ ئەکا ، کەچی کەداوە دەزووەکەی نێوانتان ترازا یەکەم کەسە هاتۆچۆی ئەو کچە بۆ پیشانگاکانو بایەخدانی بە هونەرو تێکەڵاو بوونی بەهونەرمەندان ئەکا بەبەڵگەیەك بۆ سەرو پۆتەڵاك شکاندنیو لێدانی .

— واتە ، تاقی کردنەوەیەکی قووڵت هەیە !

— تاقی کردنەوەیەکی وا کە هەرگیز لەگەڵ تەمەنما ناگونجێ، بۆیە ئەڵێم : یەکەم جارە هەست بەلێدانی دڵم ئەکەم ، یەکەم جارە لە ناخەوە بەهەموو سۆزێکەوە یەکێکم خۆش بوێ .



بێزاری لە لەشیا کەوتە میروولە کردن ، جگەرەیەکی داگیرساندو چەند مژێکی قووڵی لێدا ، کەوتەوە هاتوچۆ کردن، وەك چاوی ڕێشکەو پێشکە بکات ، ئافرەتێکی لە دوورەوە بەدی کرد ، بە باڵا ، بەخەرمانە قژە ڕەشەکەیەوە ، بەڕۆیشتنەکەی ، هەموو شێوەی لەوی ئەکرد « ئا ... خۆیەتی ، سەد شکور وا ئیتر چاوەڕوانیە سامناکەکەم چاوی لێك نا » .

هەنگاوی بەرەو شەقامەکەی ئەو بەرەوە نا ، لەگەڵ ئافرەتەکەدا بەیەك گەیشتن ، وەك مقەبای لێهات ، حەپەسا ! « سەیرە ، هەموو شێوەی ئەوی تیایەو ئەویش نییە » بە ناچاری پاشەو پاش گەڕایەوە ، چوە ناو ئوتومبیلەکەی ، دەستی خستە سەر ستێرنە کەو سەری نایە سەری ، گێژە لووکەیەك هات گەڵێ وردەکاغەزو گەڵای هەڵوە ریوی درەختەکانی تێك ئاڵاندبوو ، گەڵایەکیان لە پەنجەرەی ئوتومبیلەکەوە خۆی بەم دیوا کرد « ئەترسم لەم پاییزەدا گەڵاڕێزانی خۆشەویستیەکەی منیش بێ » دەستی بەدوگمەی ڕادیۆکە دانا ، ئاوازێ کەلەوەو پێش لە ساتێکی کامەرانییانا پێکەوە گوێیان لێی بوو بوو ، وروژاندی ، چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك« هەموو کەشتیەکان بۆ بەندەر ئەگەڕێنەوە ، هەموو بەلەمەکانیش بۆ ڕۆخی رووبار ، هەرمنم بەتەنیا لەناو دەریایەکی بەرینا بەلەمەکەم بە دەست گەرداوەوەیە ، نازانم کەی و لە کوێ ئەگیرسێتەوە » .

دەستی بۆ چەکمەجەی ناوەوە برد ، رۆژ ژمێرێکی تیابوو دەری هێنا کەوتە خوێندنەوەی لاپەڕەیکانی « ئا لەم رۆژەدا بوو پێکەوە پیاسەمان ئەکرد ، لەبەر جامخانەی کۆگایەکا هەردوکمان چاومان بڕیبوە بووکە شووشەیەکی خنجیلانەی جوان لە ناو چوار دیواری شووشە بەندابوو، هەر چوار دەوریشی هەمەجۆر دڕندەی دەم داچەقاو دەوریان دابوو ، هەریەکەیان چاوەڕوانی ئەوەی ئەکرد زووتر پێش ئەوی تریان پەلاماری بدا ، لەو سەرنج دانەمانا ، لە ناکاو هەردوکمان ، منو سەناریا ، چاومان بڕیە یەکترو هەر یەکەمان لەڕازی دڵو بیری ئەوی ترمان گەیشتین».

کەوتەوە پەڕە هەڵدانەوە و خوێندنەوەی ئەو وشانەی لەو رۆژانەدا بەگوێی سەناریایا چرپاندوە ، لە لاپەرەیەکی ترا وەستا « لەم ڕۆژەدا بوو بە تەنیا چووم بۆ کۆگاکەو بووکە شووشەی ناو جامخانەکەم کڕی و بۆیان پێچامەوە ، هەفتەی رابوردوش لەم رۆژەدا لە ژێر سێبەری درەختە جوانەکەی ناو پیشانگای گوڵ ، لە کاتێکدا دەستم بەخەرمانە قژە ڕەشەکەیا ئەهێنا ، دیاریەکەم پێشکەش کرد و پێم وت :

هیوام وایە هەرگیز ئەو دڕندانە زەفەر بە بووکەخان نەبەن ، بەپێکەنینێکی پڕ نازەوە لێی وەرگرتم ، چاوەکانی زۆر شتیان تیا ئەخوێنرایەوە کە دووبارە وتم : ئەگەر دیواری بووکە شووشەکە ، شووشەبەندە ئەبێ دیوارەکانی دەوری سەناریا کۆنکرێت بن ، سەری نایە سەرسنگم ، هەستم کرد گەرمایی فرمێسکەکانی نەك هەرپێستی لەشم بەلکو گۆی دڵیشم داخ ئەکەن » کە سەیری سەعاتەکەی کردەوە بۆی دەرکەوت سێ سەعاتە لەم چاوەڕوانیە تا لە دایە ، خەمەکانی کەڵەکە بۆ بوون، خەریك بوون هەناسەی لێ ببڕن ، زانی کە ئیتر مانەوەی بێ سوودە ، هەر لێکی ئەدایەوە « ئەشێ بە ڕاستی منیشی وەك ئەوانی تر سەیر کردبێ ، یان ئەبێ ئەو جانەوەرانە دڵیان وا ڕەش کردبێ کە لەئاستی کەسی ترا سپی نەبێتەوە ، ئەبێ هەمو پیاوێ بەوانەی دەورو بەری بزانێ ؟! »

هەر چۆنێ بێ ئەو پرسیارانە بێ وەڵام مانەوە ، کاتێ بڕیاری ڕۆیشتنی دا بۆ دواجار چاوێکی بەو شوێنەوارانەدا گێڕا ، کە هەموویان شایەتی خۆشەویستیەکەیان بوونو جارەها گەڵای درەختەکان بەووشە شیرینەکانیان ئەکەوتنە سەما ، بەدەم ڕویشتنەوە ، وتەیەکی [ ئیراسموس ] لە گوێیا ئەزرنگایەوە [ تا ژیان مابێت هیواش ئەمینێ ] .

سلیمانی / تشرینی یەکەمی 1978

# دایکی گوڵێ

نووسینی : عەبدوڵلا عەزیز خالد
سلیمانی
١٩٨٢-٣-٣١

بەفر تاکلاو ئەژنۆی هاتبوو ، خۆی تەنیا رێشکێنی بوو ، ەرسەخەرێیەکی مابوو بگاتە لای کۆختەکە ، زریانێکی بەهێز ـلاوی بۆ هێنا ، کەچی هەر بەدڵشادیەوە تەکانی بەرەو پێش ەدا . لە دوورەوە وەڕینی سەگێك راێچلەکان .. گەماڵە ۆزەی دراوسییانی هێنایەوە یاد کەپاش ھاربوونی دووجار ەلاماری دابوو ، ئیتر لەوساوە تەمی ترسی رەوی بووبوەوە ، ەربەس نەدەهات ، خۆش خۆش هەنگاوی بەرەو موراد دەنا ، ەولاشەوە دلێکی لای گوڵێ و شیرین بوو .

**ـ ( ترسم نی‌یە ئەشکەوتەکەیان لەشوێنێکی سەختایە ) .**

چاوی ئەشکەوتەکە باوەشی بەدیمەنە سروشتیەکەی ەردەمیدا کردبوو ، ئەو دیمەنە قسەکەی گوڵێی بەگوێدا ەچپانەوە :

**ـ دایە بەتەنیا مەڕۆ ، باڵەگەڵت بێن ، رێگاکەی ترسناکە .**

+ نەء ... باهەمووان تیانەچین ، یاسایەك دەڵێ : کەم ەبێناوی زورا بسووتێ ، گرنگ رێچکەگرتنی کۆڵنەدانە .

هەر لە کۆختەکە نزیك دەبووەوە ، لە دوورەوە سێ ەلامی بینی ، خورپەیەکی لەناکاو تەزوویەکی تیژی بەسەرتاپای ەشیدا هێنا ، چاوی رێشکەو پێشکەی دەکرد .

**ـ ( ئەوە مارشال و چەندرمەکانی لەکوێیوە پەیدابوون و چۆن گەشتینە ئێرە ؟ ) .**

کە ئەمیان بینی ئەوان خۆیان متکرد .. ، نەیدەزانی گەرێتە دواوە یان بەردەوام بڕوات ، قەدەرێ ڕاما ، ئاکام ەرمی رارایی دلی‌ی کوشت ، ئەوەی لەبەرچاو بوو ، هەرهەنگاوێ ەرەو دواوەبنێ کۆمەڵ قورقوشمی سوورەوە بوو دەکرێتە میوانی سەری زمانە تیژەکەی ، ترسی دووفاقی رێگاکەی ەقکرد .

**ـ ( هەر بگەمە لایان سۆراخی شوێنەکەمم لێ دەکەن ) .**

هەناسەیەکی قوولێ هەڵکێشا .... دیمەنی مەنیجە ۆجی لای ئاشەکەی هاتەوە یاد، کەپاش ئابروبردنی لەگەڵ دایکە ێەکەیدا سەرەو نگون کران .

**ـ (نەء .. خۆم بەدەستەوە نادەم ، بەددان بەنینۆك چاویان هەڵدەکۆڵم ) .**

بەڵایەکی سەختە ، خراپ تێکەوتبوو ... رابکات ؟.. ئەوا ەرسێتی خۆیانی پێ دەشکێنن .

**ـ ( خۆ دوای ئەوەی فاتەشیان سمی ، بەزاماری بەرۆی کچێتیان سوورکرد و بەچنگێ قورقوشمی‌تواوە ماڵئاواییان لەژیان پێ‌کرد ) .**

لە جەنگالی ئەو بیرکردنەوانەدا دەژیاو دەروشیت ،دەست و پەنجەی تەزیوی فەرامۆش کردبوو ، هەرهەنگاوی بەرەوپێش دەنا : ـ

**ـ ( بگەڕێرەوە ) .**

+ گەڕانەوە هەڵاتنە و پیشەی ترسنۆکە .
تەوژمی خوێن هورروژی بۆ دەم و چاوی دەهێنا.

**ـ ( ئای کەئافرەتێکی بێباکی ، کورە سەرسەختەکەی داوێتەوە سەرخۆی .... نەخێر ناهێڵم هەروا بەئاسانی بخورێم .. ) .**

بەدەم رۆشیتنەوە سووکێ دەستی بۆگیرفانی سوخمەکەی‌برد ، قەڵەمبڕەکەی برزوی بەدەستەوە هات .

**ـ چاکە .**

گەشکەیەك گرتی ، بەکوڵ ماچێکی‌کرد .

**ـ ( هەرلێم نزیك‌کەونەوە بێ‌سێ و دوو لەگێزمرەی ملەوە دەست پێ‌دەکەم ) .**

دڵنیابوو لەوەی : بگاتە لایان کاسەی سەری بەپرسیار دەبەن .

**ـ ( خۆم دەکەم بەکەڕو لاڵ ) .**

هەرخۆی وەڵامی خۆی دایەوە :
ـ ئەوە پیشەی ئێمەومانان نی‌یە ، هەر لەسەرەتاوەو ئاشکراو بەتوندی بەروویاندا هەڵدەشاخێم .
زیاتر لەکۆختەکە نزیك دەبووەوە .

**ـ ( مرۆڤ هەر جارێك دەمرێ ) ..**

بەکپی گوێی لەحەپەی سەگەکە بوەوە ، لەوەدەچوو دەستیان نابێتە بینی ، کە چفەیەکی هێواش لەوەڕینی خست.

**ـ ( ئەرێ ، ئەوا تەواو کەوتمە ناویانەوە ) .**

لێی ئاشکرا بوو یەکسەر دەپرسن : کارت‌چی‌یە ، بۆچی هاتویت ، کێت لەگەڵە ؟ .. ئەوسا یەکسەر ئەو تاوانەی دەخەنەپاڵ ، کەهاتوە شوێن پێی ئەمان هەڵگرێ ، ئەوە دڵشادی کرد و بەلایەوە باش بو کار بەم بارەدا بکەوێتەوە ، خۆ هیچ نەبێ ئابڕوی ( گوڵێ و شیرین ) دەپارێزرێ .
لەگەڵ هەنگاوناندا دڵی زیاتر و پەلەتر لێی دەدا ، رەنگی سوور هەڵگەڕابوو ، کولیی سۆزی تەواو فرۆشا .

**ـ ( ئای لەمەستی و شادی ئەو بەرەبەیانەی بۆ یەکەم جار بەتەنیا لە خوار ئاواییدا برزوم بینی ، شەرم و ناز تێکەڵ بەیەك ببوون ، مامە حەمە بێ‌قەزابێ لێی تێکداین ! ) .**

تابلۆی ئەو دیدارە تائێستاش تینوێتی نیگای چێژی پێدەشکێ و لە چوارچێوەی بیرەوەریدا بەزیندوێتی دەژی .

ئەم هەرچاری ناچاربوو ، بریاریکە و داوێتی هەر دەبێت لە کۆختەکە نزیکتربێتەوە ، دلنیابوو ، خۆحەشاردانی چەندرمەکان بێ مەلامەتنییە چەند هەنگاوێکی مابوو بگاتە لایان ، دلەکوتێیەکی تەواوی پێکەوت،سامێکی هومایی سەختی لێنیشت ، کەچی بەزاتێکی تەواوەوە پێی بەجەرگی خۆیدا دەنا .

**ــ ( بریاریکە و داومە ... پەشیماننیم لێی ! ) .**

لەدەریای هەلچوونی ئەو بیرانەدا بوو یەکێ لەزەلامەکان لە شوێنی خۆی دەرپەری ، هاواری کرد :

**ــ رزگار ، رزگار .. خۆ ئەوە دایکتە !.**

دەست بەجێ هەرستێکیان بەرەو پیری هاتن ، رزگار کت و پر باوەشی بە دایکیدا کرد ، تا تاسەی دووریان لەیەك نەشکا بەری نەدا ، ئاوەلەکانی بە دیاریانەوە وەستابوون .

دایکی رزگار دەمی لە گۆکەوتبوو ، دوو دلوپ فرمێسك لەچاوە پروپووشاویەکانیدا قەتیسمابوو ، هەنسکی شادی هەلدەدا ، قەلەجرەکەی هەر بەدەستەوە بوو ، تارزگار رووی تێکرد .

**ــ دایە ئەوەچییە ؟.**

ــ چینەبێ ، وامزانی مارشال مۆد و چەندرمەکانیان ، وتم نەك سەمەرەکەی مەنیجەگۆج و فاتە دو تازەبێتەوە .
رامانێکی سەیر پەردەیەکی خامۆشی بەسەردا دابوون ، تادایکی رزگار هاتەگۆ :

ــ کورِم : گولێ و شیرین لەو ئەشکەوتە بەرزەدان ، چاوەروانی ئاردو خەلوزی ئەم کۆختەیەمان دەکەن .
لەمەدا بوو یەکێك لەئاوەلەکانی رزگار رووی تێکردن :

ــ کات بەبەریەوە نییە ، زووکەن ، باچی ئارد و خەلوز هەیە بیبەین بۆ ئەشکەوتە بەرزە ، ئەبا مارشال مۆد شوێن پیمان هەلگرێ و شارەزای ئەشکەوتەکەنێن ئەوسا هەموویان بەشادیەوە ئارد و خەلوزەکەیان بەرە و ئەشکەوتەکە برد .

# قەندیل

ئەژی گوران

پایزی / ١٩٧٩

**قەندیل کچە جافێکی کۆچەربو ...**

ــ ئەوەتا خونچەی تەمەنی ئەلێی لێوە هەلپشکوتوەکانێتی.. گوناکات .. لەبناری کوێستانا وا بەلای بەرخەلەوە .. حەز ئەکات لەبەژخی مێپەر زیاتر هەلسێتە سەرپاشو ..

بەرخی مێپەر ...

ــ بروانە چۆن بەدەوری قەندیلا کەوتۆتە یاری ... ئەگەر گەردنی بۆ نەوی نەکات .. خۆی لەبەرۆکی هەل ئەسوێ .. لەدواوە بەقەپ چمکی کەواکەی یاداوێنی کراسەکەی ئەگرێ.. جارجارە .. رای ئەتەکێنیو سەری پێوە ئەنێ .. هەروەك بەبەر گوانی مێپەرەوە بێت ...

**[ سۆزی دایکێتی گەلێ گرانە .. گەلێ بەتامو بۆیە ... من خۆم هەرچەند لەدایکم دور بکەوتمایەتەوە .. لەهەر هەردێ بومایە سەرم ئەکردە سەر تاشە بەردێ .. بۆنی دایکم بەخاکەوە ئەنا ... مناڵیش نەبوم ! ] .**

مێپەر ...

ــ ئەگەر خۆم نەمناسیایە سوێی چاوەکانیم بەجەرگی کەسەوە

نە ئەنا ... بەراستی مێپەر دایکێتی لێ ئەباری ... وەك ئاژەل نا .. وەك دایك . چاوی پڕ بەسۆزی هەمو دەم لە سۆلاوەی بەفری لوتکەکانبو .. یاپڕ بەدل بەرخەکەی ئەلستەوە .. کاتێ بەرخەکەی شیر ئەدا.. سەرنجت بدایە هەستت ئەکرد پڕ بەهەمو قولپێکی خوێن هەنسکی شادی هەل ئەدا ... بەلێ وەك هەمو دایکێك .. لەخۆشەویستی کزەی جەرگیا .. جگە لەشادی تەمی خەمێکی هێمنیش دای ئەگرێ ...

[ ئەی بۆ نا !.. ]

ــ هەرگیز بیرم ناچێ .. کە واشەیەکی زریکە لێدراو .. داهات ... مێپەر لەتاوا بەهەمو قەبارەی خۆیەوە .. بەرخۆلەکەی لەبن گوانیا حەشاردا .. هەرگیز بیرم ناچێ ... واشەی درندە چنگی لەسەرو چاوی مێپەر داگرتو .. مێپەر بۆ یەجگاری چاوی بەسەر کوێستانا لێکنا ...

ــ ئەوەتا ئێستاش تۆ گەورەبویت ..لەوساوە نەچوینەتەوە کوێستان .. هەر ئەوساڵە بو .. وتیان بومەلەرزەیە .. رێی

ڕوێستان نیە ... ئەمساڵ نەبێ هاتوینە ئەم بنارە لەشارەزورا .. ئەویش لەتاو قاتی گەرمیان.. هەرچۆنێبێ بەرخەنازدارەکەم .. من هەر بەدواتەوەم .. لەهەر مێرگێ قولێ گیای شـــین حی بکەم .. بۆتۆی ئەدۆزمەوە ..

**ا گیای مێرگوزاری ئەم خاکە .. شیری دەرونی دایکە .. شیری مێپەرە ا**

ـ ئۆخەی بەرخەکەم .. چەند جوان پێشـــم ئەکەوی‌و ڕێ ەکەی .. ئۆخەی ! مەڕۆ .. « کریس .. کریس .. کریس » .. مەڕۆ باوانم.. بنارە .. لەمەولا هەورازە .. باماندونەبێت.. بەرخی چی !..

ـ امە خوا .. شەکی دوسالەیە .. ڕۆژ بـەڕۆژ رو لەزیاد یە .. دوگی شۆڕبوە .. هەرچەند بەرەو لای قەندیل ڕانەکات .. ڕمەی پێی ئەلێی سەرچۆپی کێشی ڕەش بەلەکە .. بڕوانە .. قەندیل تۆ سەیری کە .. چۆن بەو باسکەدا هەڵ ئەگەڕێ.. ەی‌وانتە .. کەی بەرانیش ئەوەندە تێرو پڕە ..

ـ بەرخەکەم .. بەرخە نازدارەکەم ..

ا بەرخی مێپەر وەك بۆن بەکوێستانەوە بنێ .. باسـکی ڕێد بەودیوا ئاوابو .. ڕمەی دەستو پێی لەو دیوە باسکەوە ەرگوێ ئەکەوت ئەتوت ڕمەی جەلەبێکە.. قەندیل پڕ بەهەناوی مەیـکی شادی هەڵ ئەدا .. فرمێسکی سەرکولە جوانەکانی ەهاتە خوار لەزەردەی لێویا ئەدرەوشایەوەو .. هەزارو یەك مکەرێرینە بەچۆکا دەهات ... ا .

**• ماناى ووشه گرانه‌كان**

**مێـسەڕ** نـاوی مەڕێکە بەپێی ڕەنگ هـەر وەك مێ کەژەل ـ عەشمە ... هتد .

**قـاتی** ج قحط نەبوون .. ووشکی .. بێ بارانی‌و نـەبوونی بەرهەم .

**شەکی دوو ساڵە** ئاژەل بەپێی تەمەن بەساوایی بەرخـــە وە بەدوای ئەمەشدا بەپێی تـەمـەن ئـــەبێ بە(کاوڕ) ـ ( شەك ) ـ ( بەران ) ئەم ناوانـە تەنها بۆ مەڕ بەکار دێت .

**کریس .. کریس** بۆ بانگ کردنی ئاژەڵ یا دەنگ لێ‌کـردنی بکار دێت .

# گەر خانوومام دۆزیەوە !

**چیرۆکی : سۆمەرست مۆم**

**وەرگێڕانی : محمود زامدار**

لای من وایە ، گەر ژنێ بیەوێ شوو بە پیاوێ بکـــات ، باشترین ڕێگەی بەردەم پیاوەکەو بۆ خۆدەرباز کردن لەم فاقە ، پشت‌تێکردن‌و ڕاکردنە ... بەڵام وانیە ئەمە هەر تاقەڕێگایەك بێ ..

جارێکیان هاوڕێیەکم ، کاتێ کە ڕووبەڕووی ئـــەم هەڵوێستە قورسە هات ، لە یەکێ لە بەندەرەکان سواری پاپۆڕ بوو ، بەغەیـــری فلچەی ددان هیچی کەی پێ‌نەبوو ـ ئەشبوایە بەپەلە وای بکردایە !ـ .

هاوڕێکەم ساڵێکی ڕەبەق بەم‌لاو بەولای دنیادا ســووڕایەوە .. کاتێ کە دڵنیا بوو ـ ژنان زوو ئەگۆڕێن وەك خۆی ئەیووت ـ لەهەمان بەندەردا گیرسایەوە .. کەچی لەپڕێکا ، لەسەر شۆسەی بەندەرەکەدا .

هەمـــان ئـــەو ژنەی کەلەدەســـتی ڕایکردبوو ، بەڕووخۆشییەکەوە ڕاوەستابوو ..

**جارێکیان ، پیاوێ ئەناسم کەوتبووە نێو هەمان فاقەوەو هەوڵی ئەدا خۆی قوتار بکات .. ناوی ( ڕۆجـەر شیرینگ ) بوو .. زەلامێکی بەتەن بوو ، کـــەوتبووە نێو داوی دڵـــداری (ڕۆت بارلۆ ) وە .. تەجرەبەیەکی زۆری هەبوو .. دنیادیدە بوو ، گەلێ شتی لەم باروبوارە ئەزانی ..**

**( ڕۆت )یش لەو ئافرەتانە بوو ، کە هیچ پیـــاوێ نەیئەتوانی خۆی لەبەر ڕاگرێ ، توانایەکی گەورەی لە وروژاندن‌و جۆشدانی ســـۆزو تاسەی پیاواندا هەبوو .. ئەم ئافرەتە دووشووی کردبوو ، هـــەر دوومێردەکەیشی مردبوو ..**

دووچاوێ ڕەشکۆکەو جوان‌و خەواڵووی هەبوو .. وەك بڵێی : بە ئەسر قەتیس بووبێ وابوو.وای لێت ئەکرد پڕ بەدڵ‌و بەداخەوە بڵێی : زۆر مخابنە ئەم ژنە جوانکیلـــەیە بە تاقی‌تەنیا ، ڕووبەڕووی کارەسات‌و ئازارەکانی ئەم ژیانە بێتەوە . خۆ گەر تۆش وەك شیرینگ ، دڵناسك‌و بەهێزو دەوڵەمەند بووایت ، ئەوا بێگومان ئەتووت :

« ئەبێ یارمەتی ئەم ئافەریدە نازدارە بدەم‌و خەمی نێو ئـــــەو دووچاوە تەماوی‌یەی بسڕمەوە .. » .

شیرینگ بۆی گێڕامەوەو ووتی :

« هەموو لایەك بەربەرەکانێی ( ڕۆت ) یان ئەکرد ، زۆر چارەڕەش بوو .. مێردی بکردایە ، مێردەکەی دارکاری‌ی ئەکرد ، گەر متمانـەی

بەبەکێ بووایە ، ناپاکی لەگەڵ ئەکرد ، هەموولایەك ، لێی وروژابوون.. گەر تروسکەیەکی بەدی بکردایە ، زوو لە دەستی دەرئەچوو .. ».
شیرینگ ئەیووت :

گوایە بەم دوایی‌یە ، داخوازیی کردوە ، زۆر شادمان بووم ..
ـ نیازخوازم بین بە دوو دۆستی گیانی بەگیانی ...

شیرینگ وەڵامی دامەوە :

**ـ کـــەچی رۆت نەختێ لێت ئەسلەمێتەوەو بەکابرایەکی بێزەوقت تێئەگا ..**

لەوەڵاما ووتم :

ـ نازانم بۆ واهەست ئەکا .. راستە تۆ خۆشت ئەوێ ، بەڵام من زۆر بەزەییم پیادێتەوە ..

نەمئەتوانی لەمە زیاتر بڵێم ، چونکە ئەمزانی رۆت زۆر مێشـــك پووتەو زۆریش کەللەڕەقو خەریکی داودانانێکیشـە .. بۆ یەکەمجــار لەســەر مێزی پەپازدا دیم ، هاوبەشی یاریم بوو ، دووجــارانیش زۆر بەخراپی پەپازی پێم دۆڕاند .. کەچی من وەك فریشتە هەڵســوکەوتم لەگەڵ ئەکرد .. حەزم ئەکرد خەمی ئەو لەخۆم بار بکەم ، من لەجیــاتی ئەو فرمێســك بڕێژم ..

ئەو ئێوارەیە پارەیەکی زۆرم دۆڕاندبوو ، پێی ووتم : گوایە بەیانی چەکێکم بۆ ئەنێرێ ، کەچی زۆر چاوەنۆڕبووم‌و هیچ .. لەپاڵ ئەوەشا ، وامئەزانی گەر جارێکی‌تر بیبینمەوە من شەرمەزار ئەبم نەك ئەو ..

شیرینگ بەهەموو هاوڕێکانی خۆی ناساندبوو .. زێڕو شـــتی گرانبەهای بەدەستوودیاری بۆ ئەهێناو لەتەکیا بۆ ئێرەو ئەوێو بــۆ هەموو شوێنێ دەرئەچوو .. جاڕی هەموو لایەکی دابوو ، کە هەر بەم زووانە ئەیخوازێو ئەبێ بەهاوسەری .. زۆر بەختــــەوەر بوو .. بەڕاستیش رۆجەر کارێکی چاکی ئەکرد ، چونکە ئەمە ئەرکێکی ئەوەندە ئاسایی نەبوو، بەڵام بۆ رۆجەر، نەء، چونکە زۆر خۆی خۆشئەویست..

رۆژێکیان لەنکاوێکا ، رۆجەر گۆڕاو پشتی لـــــە رۆت کرد .. نەمئەزانی بۆو لەپایچی .. بێگومان لەبەر زۆر بلێ‌یی‌و پیلەی لابــەلاو ناپەسـەندی رۆت نەبوو ، چونکە رۆت زۆر کەمدووبوو .. دوور نیـــە لەبەر ئەوەبێ کە رۆت سۆزوگوڕ‌زی جـــارانی نەمابێت‌و رۆجەریش چاوی کرابێتەوەو بووبێتەوە بەهەمان پیاوی جاری جارانی دنیادیدەو ماران گەستە ..

رۆت بڕیاری دابوو ، شووی پێبکا .. بۆیە رۆجەر سوێندی خوارد کە نابێ ئەم ژنە بخوازێ .. کەچی کار لەکار ترازا بوو ، تازە رۆجــەر کەوتبووە نێو فاقەوەو ئەشیزانی ئەم ئافرەتە چ جۆرە ئافرەتێکــــە . ئەشیزانی گەر : داوای جیابوونەوە یا دوورکەوتنەوەی لێبکات ، ئەوا رۆت چی پێئەکات‌و چۆنیشـن تۆڵەی لێوەرئەگرێت .. لەســـوچێکی ترەوە ئەیزانی زۆر تەنگ‌و شوورەیی‌یە ، پیاو داوا لەژن بکات تا وازی لێبێنێ ..

ناچار ئەم بڕیارەی خۆی بەنهێنی هێشتەوە .. وەك جاری جاران هەڵســوکەوتی لەگەڵ ئەکردو خواســت‌و ئارەزووەکانی بەدی ئەهێناو لەچێشتخانەکانا ، نانی شێوانی لەگەڵ ئەخواردو چەپکەگوڵی بۆئەکڕی‌و پیاسەی پێ‌لێئەدا .. دواجار بڕیاری یەکجارەکییاندا ، گەر خانوویان دەسکەوت ، ببنە هاوچارپایەی یەکتری ..

کەچی خانووی شیاوی وایان هەر دەس‌نەکەوت .. خۆ کـــــە دەستیشیان نەکەوت ، ئەوا یا گەورەبوو ، یا زۆر بچووك ، هەندێ جار ئەکەوتە دورەوشار ، یا زۆر نزیکەشار .. هـــەندێ جــار کرێکەی زۆرگران بوو ، هەندێ جار پێویستی بەپینەوپەڕۆ ئەکرد .. هــەندێ جاریش ناساز بوو ، هەندێ جار تاریك‌ونووتەك‌و ســــاردوسڕ .. ئەمانە هەمووی ببووە ، بڕوبیانوو ، بۆ رۆجەر ، تاخۆی لەهێنانی رۆت بدزێتەوە .. نەینەویست رۆتی ئازیز لەنێو خانوویەکی لەبارو خۆشدا نەبێ ..! ئەمجۆرە خانووانەیش پێویستی بەگەڕان‌و سووڕانە ..

رۆت وردەوردە بێزار بوو .. رۆجەریش تکای لێکرد ، نەختێ ئارام بگرێو پشوو درێژ بێت‌و رۆژێ هەردێ ، خانوویەکی باشـــیان دەسکەوێ ..

بەدودان سەدان خانوویان پشکنی‌و بەسەر هـــەزاران هـــەزار پەیژەدا سەرکەوتن‌و هەزاران جۆرە مەتبەقیان بینی ..

رۆت تەواو نیگەران‌و شەکەت بوو :

**ـ گەر خانووت نەدۆزیەوە ، ئەوا ناچارم بیر لـــەم هەڵوێستەی خۆم بکەمەوە ، گەر کاریش وابڕوا ئەوا ناڵوێ من‌و تۆ ببینە هاوســەری یەکتری ...**

ـ نەء ، نەء ، ئەمە مەڵێ ، ئەمڕۆ لەدەڵاڵەکانەوە ، سێ لیستەی تازەم پێگەیشتووەو شەست خانووی تێدایەو ئەتوانین بیانپشکنین..

دەستیان بەپشکنین کردەوە ، گەلێ خانووی تازەیان پشکنی .. دووسالی رەبەق چەرخیاندا .. گەڕان‌و سووڕان .. هەرهیچ ..

رۆت زۆر دڵتەنــگ‌و بێدەنگی دایگـرت ، چــــاوە جوانەکانی لێواولێوی خەمێکی قووڵ‌و شیرین‌و مرۆڤانە ، بوونەوە .. لە فریشتە بەئارامتر بوو ، لەئەنجاما دڵی پـڕبوو • بـــەدەنگێکی ســـــەیرو بەسووربونێکەوە وتی :

ـ رۆجەر ، تۆ ئەتەوێ بمخوازی یانا ؟

ـ بێگومان گیانەکەم ، گەر خانوومان دۆزیەوە .. هــەر بەم بۆنەیە ، بیستوومە خانوویەکی واهەیەو بۆ ئێمە دەس‌ئەدات ..

ـ بەداخەوە من توانای ئەوەم نەماوە ، ئەوەندە بگەڕێم‌و بسوڕێم‌و زۆر بێتاقەتیش بوویم ...

دوو شانۆگەریی کورت(*)

گۆڕینی : مەجید ئاسنگەر
نووسینی : هاینەر میللەر

# « هاوڕێیەکە بوو »

سەربازی یەکەم : هاوڕێیان ، ئیتر توانای بینینی دووژمنم نەماوە .

سەربازی دووەم : ئەشێ لەبرسانا بێت .

سەربازی سێیەم : بگرە لەبەر بەفرو زریانەکەیە .

سەربازی چوارەم: ئینجا خۆ دوژمن لەگشت شوێنێکدایە .

سەربازی دووەم : هەر کاتێ سکم بەتاڵ بێ ، تەنیا تاکە دوژمنێ دەمێنێ .

سەربازی چوارەم : مەبەستت چییە ؟

سەربازی دووەم : مەبەستم ئەوەیە چوار هەفتەیە تامی گۆشتم نەکردووە .

سەربازی سێیەم : من ئامادەم تێکرای وولاتێك بکەم بەقوربانی پارچە ئێسقانێك .

سەربازی چوارەم : ئێمە لەپێناوی ئەلمانیا دایە برسێتی دەچێژین .

سەربازی دووەم : جا ئێستێ ئەلمانیا بەچ دەچێ ؟ لەوانەیە لەم چوارەمان بەولاوە کەسێکی تر نەما بێ .

سەربازی چوارەم : ئێمە یەکێکمان زیادین .

سەربازی دووەم : « رووی تفەنگ دەکاتە سەربازی چوارەم »: بەسیەتی چەنە بازی .

سەربازی چوارەم : مەبەستم ئەوەیە .. ئێمە براین ... ئەمە واتای ..

سەربازی دووەم : بام هەریەك لە ئێمە پاشەرۆکی براکەی بخوات .

سەربازی چوارەم : سێمان تێربین چاکترە تا هەر چوارمان برسی بین . دلسۆزیی نیشانەی بەرزییە !

سەربازی سێیەم : « سەری دەلەقێنێ نیشانەی رەزامەندیی » : تاك لەپێناوی کۆمەڵدا !

سەربازی دووەم : ئەو پرسیارەی لێرەدا سەر هەڵدەدات ئەمەیە ــ کێ لە ئێمە ئامادەیە خۆی بەخت کات ؟.

«سەربازی دووەم و سێیەم و چوارەم لوولەی تفەنگەکانیان لێکدەکەن » .

* سەربازی یەکەم : براینە ، چیتر دەستم چەك ناگرێت !

---

رۆت بەتەواوی شەکەت ببوو ، لەماڵ کەوت و نەیتوانی لەگەڵ رۆجەردا بچێتە دەرەوە .. ئەمیش جارناچار سەری لێئەداو چەپکەگوڵێکیشی بۆ ئەهێنا ..

لەپاش حەفتەیێ ، ئەم نامەیە گەیشتە دەستی رۆجەر :

« رۆجەر ، من باش ئەزانم تۆ منت خۆش ناوێ ، یەکێکی تازەم دۆزیوەتەوەو ئەیەوێ ببێتە هاوڕێی ژیانم .. ئەمڕۆ لەسەر چارپایەیەکا ئەبینە هاوسەری یەکتر ..

رۆت »

رۆجەریش لەگەڵ نامەیەکی تایبەتیا وەڵامی دایەوە :

« ئاخ ! منت کوشت ! بیرای بیرای ئەم کارەم لەبیر ناچێتەوە .. بەڵام بەختەوەری تۆ لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە، لەگەڵ ئەم نامەیەدا حەوت لیستەی خانووی تازە هەیە،کە ئەمڕۆ لەپۆستەوە پێم گەیشتوە.. هیچ گومانیشم نیە ، لەنێو ئەو لیستانەدا ، خانوویەکی وائەدۆزیتەوە، کە بەدڵت بێت و شیاوی خانوونێکی وەك تۆبێ ...

رۆجەر »

سەرچاوە

جریدة العرب ــ اسبوعیات الثقافة ــ ١٣ــ١١ــ١٩٨١ .

« ســـەربازی دووەم و ســـێیەم و چوارەم چەکەکانیان فڕێ دەدەنە سەر زەوی و لەیەکتر رادەمێنن » .

* سەربازی چوارەم : تفەنگەکەتم بدەرێ ، هاورێ . من بۆتی هەڵ دەگرم . « تفەنگەکەی لێ وەردەگرێت و دەیداتە بەرگوللە » :

چووکترین ئەلقەیوو لە زنجیرەکـــەمانا و مەترسییەك بوو بەسەرمانەوە . کـــەچی وائێستێ دەبێتە هۆیەك بۆ تێر بوونمان . ئەمەیش بناخەیەکی سەرەتاکانی برایەتی‌یە .

**« سەربازی دووەم و سێیەم و چوارەم ، سەربازی یەکەم دەخۆن » .**

# شەوی چەقۆ درێژەکان

* یەکەم : لەکاتێکـدا شـەوەکە . بەهۆی ســـووتانی رایخشتاخەوە ، بووبوو بـەرۆژی رووناك ، من براکەمم دی ، لای دەرگاکەوە وێستابوو ، دەستم بۆی درێژ نەکرد .

* دووەم : برام . بۆ خۆتم لێ نەناس دەکەیت ؟ .

* یەکەم : گەر برام بوویتایە ئەناوا لەبەردەمما نەدەوەستایت، لەکاتێکدا خوێنی هاوڕێکانمان لەدەستەکانتـــا دەتکێتەوە . خۆزیا دووجار دەمردیت .

* دووەم : ئاواتی منیش هەر ئەمەیە ، براله هەربۆیەیشـــە هاتوومەتە لات .

* یەکەم : تۆ هەر بە « برا » بانگم دەکەیت کەچی من چیتر برای تۆ نیم . چەقۆیەك لەنێوانی منو تۆدایە ناوی ( ناپاکی‌یە ) ! هۆی ئەمەیش هەر خۆتیت .

* دووەم : ئەگار وایەو خوێنیش لەدەسما دەتکێت . کەوابوو شایانی هـــەرچییێکم پێمی ببەخشە . مـــەرگم پێ ببەخشە .

* یەکەم : ئەمەی ووت براکەم . ئەو برایەی بۆ من بوو بوو بەبێگانـــەو نیشانەی ئابڕووچوون . پاش ئەوەی هێند ئازاریان دابوو تا وای لێهاتبوو کراسێ خاکی کردبووە بەرو لەناو خوانیاندا بەشدار بووبوو . ئەو برینانەیش بە لەشیەوە جێیان هێشتبوون هێشتا سارێژ نەبوو بوون . ئەمەتا ئێستەیش وا دەمانچەکەی لەســـەر مێزەکـــەما دادەنێت ! پێویستە بەدەستی خۆت ئەمە بکەیت .

* دووەم : ئەگەر ئەمەم بکردایە ، برام . هیچ سێ و دووم لێ نەدەکرد . ئێستا وەك جاران نەماووم .

* یەکەم : ئەمە پەیوەندی بەمنەوە نی‌یە .
* دووەم : بەلام هەردووکمان لەدایکێکا بووین .
* یەکەم : لەکوێوە هاتوویت بچۆرەوە بۆ ئەوێ .
* دووەم : لەکارگەدا لەنزیك تۆوە وێستا بووم .
* یەکەم : گەر دەمزانی رۆژگارت بەم رۆژە دەگات نیـــازم دەخواست ئامێرەکە پارە پارەت کات .

* دووەم : هەروەها لەمانگرتنە گشتییەکەشدا بەشـــداریم کرد . تەنانەت کە لەنزیك دەرگای براندنبورغدا لەتەك ئەوانی ترەوە ، بەژیانی هیتلـەرەوە هۆتانم دەکیشا ، لەراستیدا دلم هەر بەلای تۆوە بوو .

* یەکەم : تۆ واکراسێکی خـاکیت لەبەردایـە ، ئەمـــەیش راستی‌یەکەیەتی . ئێستێ و ئالێرەدا .

* دووەم : راســـتییەکەی . ئێستێ و ئالێرەدا . دەتەوێ بیخوێنیتەوە ؟ فەرموو : ــ

بۆ سێ هەفتەی تەواو پەڕەیە کاغەز بووم دوژمنی منو دوژمنی تۆ راستیی خۆی لەسەرا نووسی. ( کراسەکەی دادەکەنێ و ســنگی دەردەکەوێت ) خاچی چەماوەی دروشمی نازی‌یەکانی تیـــاد' هەڵکەنراوەو نیشانەی زامەکانی ئاشـــکرا پێوە دیارن ) :

ئابەم جۆرە براکەت . جگە لەناپاکەکە هیچی لێ نەماوەتەوە .

* یەکەم : چارە روانی چی دەکەیت ؟ پێویستە فەرمـــانی خۆت بەجێ بگەیەیت . برا .
ئەوسا دەبینیت لەپای بۆچوونەکانمـــەوە چـۆن ئازاریکم دەدەن .

بەلام ئەوان هەرگیز ناتوانن منیش بکەن بەسەك!

* دووەم : حەزدەکەی بۆتی بگێڕمـــەوە چۆن مرۆ دەکـەن بەسەگ ؟

* یەکەم : پێویست بەقسە ناکـات خۆت نموونـــەیەکی زیندووی ئەمەیت . ئەی سەگ ، بگەڕێرەوە نێو پێستەکەی خۆتەوە ، وا سەگەکانی‌تر لەدەرەوە دەلوورێنن . بگەڕێوە بۆ لایان تابەشـــی خۆت وەرگریت .

« بێ‌دەنگی . هاتو هاوارێك لەدەرەوەدا » .

* دووەم : لەژێر زەمینەکانی گۆســـــتابۆدا پەنام وەبەر بێدەنگی برد . بەلام کاتێ هاتمـــە دەرەوەیش رۆژگار لەجاران خۆشتر نەبوو ، ئێوەیش رووی خۆتانتان لێ وەرگێڕا ، وەك هەر نەشمناسن ، هەرچەندەیش هێشتا خوێن لەژێر کراسەکەمـا ووشکەوە نەبوو بوو . لەپێناوی ئێوەدا پشـتم دانەواند ، کەچی لەناو کەلاوە کۆنەیشا شوێنێکم بۆ خۆم نەدۆزییەوە .

وەبۆ جاری دووەم ، کە لەدوای سێ هەفتـــە گرتمیانەوە،ئاوام هەست کرد وەك ژێر زەمینەکان نیشتمانم بن !

سەگ هەمیشە شتێ دەدۆزێتەوە حەیای خۆی پێ داپۆشێت . چەرخیش بەلای راســـــتەوە دەسوورێتەوە ، تۆیش هیچت بۆ ناکرێت قامچی هەژاندن نەبێ ، کەچی ئەوانی‌تر هـــەر هـاوار دەکەن .

ئا ئەمەبوو ئەوەی روویدا ! باش سەیری ناوەوەی خۆمم کرد ، کە شەوی چەقۆ درێژەکان داهـاتو بەشوێن ئەوەدا دەگەڕا کـــە سەرکەوتوو بوو ، تێگەیشتم کە یەکەم کەس‌و دوا کەس هەر خۆم بووم . . . وەزانیم کە ئێمە یەکێکمان زیاد بووین . سا فەرموو دەمانچەکە هەلگرەو ئەوەی بـــەمن ناکرێت ــ تۆ بیکە ، تاکو لەپاش مردنیشدا هـەر سەگ نەبم .

* یەکەم : لەوکاتەدا کەژێر زەمینـــەکان بەهـــاواری هەڤالەکانمەوە پڕ بوو بوون ، وە کـە چـــەقۆ درێژەکان بەرلین‌یان دوولەت دەکرد،من ناپاکەکەم کوشت .: براکەی خۆم کوشت .

**سەرچاوە :**

**(*) لە گۆڤاری ــ الاقلام ــ ی ژمارەی تایبەتی بـــە شانۆی جیهانی‌یەوە ، وەرگێڕراون .**

ئەوەن ڕۆژێ هێشتا کە من بەشاران و دێهاتانا
وێڵ و شەیدام
خەڵکینە! هاوارم بە دەنگی بەتینم هاوارە
کێ ئەو شتەی بینیوە بەپێی
دەڵێت وەفا




حسین رشوانی

# کاروان

ژیانی مرۆڤ لە سەر ڕوی ئەم زەمینە بەگشتی وبەتێکڕایی بریتیە لە کاروان ، چە کاروانێك ؟ کاروانیکی وا سەرەتایی دەست پێ‌کردنی هەتا ئێستا نەزاندراوە ، چونکە قۆناخی یەکەمی کاتو شوێنی هەر بە نهێنی ماوەتەوە ، چونکە هەتا ئێستا ئادەمیزاد بەم هەمو تواناو دەسەلاتی کە لە باری زانستو زانیاری پەیدای کردوە نەیتوانیوە بە قەد تۆسقالی لە چەندو چوونی سەرەتایی پێك هاتنی ئەم کاروانە ئاشکرا بکات ، هەر وەك پەردەیکی رەشو ئەستور ئەم سەرەتایەی داپوش بێ کە خەیالو ئەندێشەی مرۆڤ پێی نەگاتو تێی نەگات .

هەروا ، کۆتایی ئەم کاروانەش وانەبێ روونترو ئاشکراتربێ لە سەرەتاییکەی پەنهانی کۆتایی بەجۆرێکی وایە کە کەس ناتوانی ڕێگەی ئەندێشەو بیر دەربکات بەرەو دووا قوناخی ئەم کاروانە .

وهەر ئەم پەنهانی وشاردراوەو نەزانراوی دووا قوناخی ئەم کاروانەیە کە بویتە هۆیەکی کاریگەرو بنچینەیی بۆ ئەمە کە مرۆڤی ئەم سەر زەمینە رۆژ بە رۆژ سەردەم بە سەردەم کاروانەکە پتر تاوبدەنو زیاتر یێژ رەوی بکەن بۆ ئەوەی پتر قوناخان ببرنو بی‌پێچنەوە .

جا ، بەهوی لێکدانەویکی زانستیانە دەرکەوتووە کەمرۆڤ هەتا ئێستا چەند قۆناخێکی دیاری کراو وناسراوی بڕیوە لە هەر یەك لەم قۆناخانە چەند دەست کەوتێکی وای بەدی هیناوە کە باری ژیانی بۆ سووك ترو خۆش‌تر بکات وەك : دۆزینەوەی ئاگرو فێربۆنی چاندنی دانەویلەو کەوی کردنی ئاژەلو پەرەوور ودروست‌کردنی کونجی حەوانە و دۆزینەوەی ئاسن دبابەتە مەعدەنەکانی‌تر بۆ دروست کردنی کەرەستە وئامێری جوراو جوری کشتو کالو راوو جەنگ وناومالو رازانونەوەی ، ودروست کردنی چەرخ ( دولاب ) کاریکی گەلەك گەورەی کردوتە سەز شدیانی مرۆڤ .

بەم جۆرە کاروان لەسەرەخۆ پێ بەپێ هەنگاو بەهەنگاو گەیشنە کۆتای سەرەکانی ناوەندی هەروەك هەمو کەس خوێندەدار دەیزانێ .

بەلاّم لە گەل ئەم کاروانە مرۆڤیش هەر نەتەوەیێك کاروانی تایبەتی خۆی هەبوە ، هەر نەتەوەیێك کاروانی خودی خۆی پێك هێناوە وڕێگای سەختی بەرەو ئامانجی چارەنووسی خۆی

گرتوتە بەر ، بەرەنگاری هەزاران کۆسپ وتەگەرەی دژداربووە ، وچەندان هەزار هەوراز ونشێوی بڕیوە ودژی سەدان جۆرە دوژمن جەنگاوە، چە دوژمنی سروشتی چە

دوژمنی درندەو جانەوەر وچە دوژمنی ئادەمیزاد ، وتووشی هەزاران تەنگ و چەلەمەی ناخۆشیو ترسناکو سەدان کۆسپەی زلو قۆرتی قوول بووە ، و هەمو زەحمەتو ئازارێکی کێشاوە کە رێگای دوورو درێژی هەر قۆناخێکی ببڕێ .

جا وانەبێ هەمو نەتەوێك وەکو یەك ئەم کاروانی ژیانیان بردبێتە سەر چونکە لەم رووەوە هەر نەتەوێك بە گوێرەی خاسیەتی تایبەتی خۆی ئەنجامێکی تایبەتی هاتوەتە پێش .

ئەم نەتەوانەی کەم دەستو بێدەسەلات ولاواز بوینە چەند قۆناخێکیان بڕیوە لەم کاروان تایبەتیەیان ، لە پڕ دوچاری دوژمنی وا نەقولا بوینە رێگای ژیانیان لێبەستراوە وکاروانیان تەفرو توونا بووەو خۆیان لەناو چوینە ودووایان برایتەوە بەشێوەیەکی واائاسەواریان نەماوە ، ونەیانتوانیوە ناوو نیشانێك لەپاش خۆیان بەجێبهێڵین کە لەمێژووا ناویان بکەوێتە نیو ناوانی بەهرەدارانی کەکاریان کردوتە سەر رێڕەوی ژیانی مرۆڤ .

نەتەوەی وا ئازاو نەبەزو بەتواناو هەلکەوتووش هاتوون توانیویانە کە ئەم قۆناخانە باش ببڕن وسوودێکی فراوان بە مروڤایەتی بکەینن ولە پاش خۆیان ناوو نیشانێکی بەرزو بە نرخ بەجێ بهێلن وناوو دروشمی خۆیان لە سەر دابنێن وهەمیشە ناویان لە نێو لەپەڕکانی مێژوا بە شانازیو رێزەوە باس دەکرێن ، وچەند نەتەوەیێکی واش هەن کە لە سەرەتای مێژودا لە کاروانی ژیاندا بەردەوامن وهەر قۆناخیکیان بەهەزار زەحمەتو ئەشکەنجە دەبڕن وتووش هەزاران کۆسپو گرفتی گەورە بوون وهەورازو نشێوی هەناسە بڕیان زۆر بڕیوە وریگای سەختو سامناکیان داوەتە پێش خۆیان رلەشەومزەنگانی پڕ مەترس کاروانیان هاژوتووە ، ورێگایان شەت کردوە لە نیوان جۆرا وجۆری دوژمنی دڕندە بەسەدان جار تووشی کارەساتی وادژوار بوینە کەئەوەکارەساتانە گەلەك نەوەی لەسەر روی زەبنی براندووتەوە وبەرەو هەلدیری نەمانی توداوون وزەگ وریشەیانی لە بن رىبۆنکەوە هەلتەکانووە ، بەلام ئەوانە لەبەر چاوقایمی خۆیان وبەگیانبازی خۆیان وبەچالاکیو دلێری خۆیان بەسەر هەموو ئاستەی ژیاندا زالبوون وهەمیشە لەبەردەمی مێژودا زەقبوینەوە ، ومیژو داقی وورمایە و تاسایە دەربارەی بەرگری سەختی ئەم نەتەوانە بەرامبەر نەمان .

بەلام لەگەل ئەم هەموو ئازاییو نەبەزیەی کە هەیانبووە نەیان . توانیوە کە هاوبەشیەکی وا دیار بکەن نموودی هەبێ بۆ پێش کەوتن مرۆڤایەتی لە باری شارستانیو رانستو فلسفەو داهێنانی بەرهەمی وا کە مرۆڤایەتی بە تێکرایی سوودی لێوەربگری چونکە بۆ ماوەیەکی دوور ودرێ؟ بێبەش بوینە لە دامو دەزگای دا بەتوانا کە بتوانێ ئەم جۆرە بەرهەمانە بهێننە دی .

جا یەك لەو نەتەوانەی چینی سیەم نەتەوەی کوردە . کە لە کاروانی تایبەتی خۆی بە دەیان سەدە هەر بەر دەوانە وهەتا ئێستا چەند قۆناخی گرنگ لەدووای گەلانی پێگەیشتوو بەجێ ماوە ، کە چی لە هەولو تەقەلاو کوششو خەباتی سەخت هەرگیز درێخی نەکردوە .

جا دەبی هۆی سەرەکی دووا کەوتنی چیبی ؟ ئایا رێگەی خەباتی بەهەلە گرتووتە بەر ؟ ئایاپێش رەوی کاروانی هەمیشە نەشارەزاو نەخام بووە ؟ ئایا کۆسپ وناشوبو شەبوی تاریکی پتر کەوتووتە پیش ؟.

ئەم هۆیانە راستبن ؟ یا هەتا ئێستا هۆی راستەقینەی دووا کەوتنی نەتەوەکەمان نەدۆزێبێتەوە ، بەهەر حالی دەبێ رێگایەکی تازە بۆئەوە بدۆزینەوە کە نرخ ورێزمان لە ناو گەلانی جیهان ئاشکراو دیارێ ؛ ئەویش رێگای زانستو خوو وروشت وبەهرەی وا کە بەرهەمی بەنرخ دینێنە جی بێ گومان ئەم رێگایە ریگایەکی رەوشەن ورۆناکو راستە گەلەك نەتەوانی سەر جیهان سەرفراز کردوە وپێیگەیاندوی . وەهەرئەو رێگایەش نەتەوەی کورد دەگەینیتە ریزی نەتەوانی تر ونرخی دای پێدەبەخشی کە هەموو نەتەوەیێك رێزی لێبگری وحەز لە دوستایەتی بکات وشانازی بەبرایەتی بکات وئامادەیی خۆیان پیشان بدەن بۆهەموو جۆرە یارمەتیەك بەرامبەر بەزانست وهونەر وئەو رەوشتە بەرزانەی کەبتوانی پیش کەش نەتەوانی تری بکات .

هیوامان وایە ئەم « کاروانە » ی ئێمە بێتە هەلگری مەشخەلی کاروانی نەتەوەکەمان لەمپلەیەدا ، وهیوا دارین کەهەموو داناو زانای پێگەیشتو وتێگەیشتوی وولاتەکە بەشداری تێدا بکەن ، بەهەستی نازکو ئەندیشەی قوورو بیریراست ورەوان دباوەری رەوا ورووون .

ئەم « کاروانە » مان بکەن بەرابەری گەلەکەمان ، کە رێگایەکی راستو خۆش وفراوانیان بۆبدوزتەوە ، وکەلەپوری نەتەوایەتیمان بەزمانو ێژو مێژو هونەر بۆزیندو بکاتەوە بەریگایی لێکۆلینەوەیێکی زانستیانە وراستەقینە .

دەردو ئازاری گەلەکەمان دەست نیشان بکات ئەنکوست بۆتیماوی درێژ بکات ونیشانە وقوچەکی دیارو ئاشکرا لەسەر ریگەی ژیانی پاشە رۆژمان دابنێت بۆئەوەی چیدی لەناوپاش کاروانی نەتەواتیمان رێگای لێنەشێوی جاپشتی هێوامان ئەستوور وقایە کەئەو ئامانجە پیرۆزانە پەیتا پەیتا پلە بێنەجێ بەهۆی دەستو بوردی دلسۆزانەی روشەنبیرانو روشەن دەرونان لەنووسران ولێپرسراوانی وولاتەکەیان .

# ئەوانەی دێنە دنیاوە بۆ ئەوەی لەگەڵیدا ناكۆك بن

نووسینی : امیر اسكندر
گۆڕینی : فیصل مصطفی
لە گۆڤاری ( الدستور )ەوە

زۆرانبازیی نێوان پیاوی سیاسەتو پیاوی هونەر، لەسەردەمێكی زۆر كۆنەوە هەر بووەو بەردەوام لەكایەدا بووە. هەندێ جار لەروو دەبێو سەر ئاو دەكەوێ ، هەندێ جاریش مت دەبێو لە قوولایدا حەشار دەخوا . مێژووی سیاسەتو هونەر هەردووك ، چەندین لاپەڕەی دوورو درێژیان تێدان كە حیكایەتی ناكۆكیی نێوان سیاسەتو هونەر دەگێڕنەوەو كە تایبەتیی‌یش نین بەم پلەی كۆمەلایەتیی دەسنیشانكراوەوە یا بەخودی ئەو رژێمی ئابووریی‌یەوە ، بەلكوو نزیكەی گشت ئەو پلەو رژێمانەی گرتۆتەوە كە كۆمەلگاكانی مرۆڤایەتی هەتا ئێستا بەخۆیەوە بینیون .

( ڤاگنەر ) ی مۆسیقازانی مەزن لە كتێبەكەیدا «هونەرو شۆڕش » وتوویە : « هونەر بریتیی‌یە لەو خۆشیی‌یەی مرۆڤ كە ببێتە خاوەنی خودی خۆیو كەبژیو بلكێ بە كۆمەلگاوە » . هونەر لە دەولەتی ( ئەسینا )دا لەسەدەی شەشەمی پێش زایندا ئاوەها بووەو بەلام بەهەرەس هێنانی ئەو دەولەتە ، هونەری بەرفراوانیش هەرەسی هێناو رووی لە پەرت بوونو تاكەیی كردو لەوە كەوت ببێتە نواندنێكی سەربەستانەی گەلێكی سەربەست . بەم جۆرە بەدرێژایی دوو هەزار سال ـ واتە لەو وەختەوە هەتا ئەم رۆژانەمان ـ لەسەر باری چەوساندنەوە مایەوە . هەروەكوو ئامۆژگاریی‌یەكانی مەسیح كە بڕیاری یەكسانیان لەنێوان خەلكیدا دا ، گۆڕدران بە ئامۆژگاریی‌یەكی ئەوتۆ كە كلپەی ئایینیان كوژاندەوەو وایان لێهات دەست بخەنە ناو دەستی جۆرە شارستانێتیكی وەهاوە كە توانی هونەرمەندان بخەلەتێنێو دەستەمۆیان بكاو ئەو هونەرەی لەهێزو سەربەستیی‌یەكەی بێبەشی كرد ، بكاتە نۆكەرێك بۆ چینە حوكمڕانەكان . بەلام لەگەل هەموو ئەمانەشدا ، هونەری راستەقینە بەدرێژایی ئەو بیست سەدەیە هەرماو تا ئێستاش بەینێك لەم لاو بەینێك لەولا،وەك هاوارێكی خۆشی یا ئازار لەنێوان كۆتو پێوەندی داهێنەرە سەربەستەكانەوە دەردەپەڕێو خۆی دەنوێنێ ، ئەگەرچی

تەنیا شۆڕشێکی مەزنی جیهانگیری دەتوانێ تەواوی سەربەستی بەهونەر ببەخشێتەوەو درۆزنی‌یە بەردەوامەکەی شارستانێتی نەهێلێ‌و گەل بگەیەنێتەوە رادەی مرۆڤایەتی‌یە هونەر پەروەری‌یەکە » .

ئەم « شۆڕشە مەزنە جیهانگیری » یەی کە ـ فاگنەر خەونی پێوە دەدی ـ هەتا ئێستا ڕووی نەداوە ، بگرە ئەو خۆی لە ڕاپەڕینەکەی ( ئەیار )ی 1849 دا ، لە سەنگەرەکانی « دریسدن » دا بۆی جەنگاو کەچی وەختێ لەلایەن هێزەکانی برووسیاوە ڕاپەڕینەکە تێکشکێنرا ، ناچار بوو هەڵبێ بۆ دەرەوەی ئەلەمانیا . بەهەرحاڵ فاگنەر لەم ڕووەوە تاکە نموونە نی‌یە ، بەڵکوو زۆری‌تر هەن کەرەنگە ئەوان ئاشکراترو قووڵتر ئەو رەوتی ناکۆکی‌یەی نێوان هونەرمەندانێك کە بەهۆی هەڵوێستی سیاسی‌یانەوە ناوو ناوبانگیان دنیای گرتۆتەوەو سیاسی‌یانێك کە بەکارو کردار ئەو هەڵوێستانەیان بەدی هێناوە بنوێنن . بۆ نموونە حیکایەتی دۆستایەتی‌یە تونددو تۆڵەکەی نێوان نووسەری گەورەی ڕووسەکان مەکسیم گۆرکی‌و پێشەوای شۆڕشی ئوکتۆبەر لینین ، لای هەرکەسێك ئاشکرایە کەتەنیا کەمێك لەمێژووی ئەو پلەیە بزانێ . بگرە لەمەگرنگتریش ، دەوری گۆرکی خۆی‌و « پابەندی یەکەی » لەگەڵ شۆڕش‌و ئامانجەکانیدا . کەچی لەگەڵ ئەوەشدا وەختێ گورکی کەوتە دەربڕینی هەندێ بیروڕای ئەوتۆ سەبارەت بەهەندێ مەسەلەی سیاسی کەلینین وای بۆ چوو نەفامی یا تێگەیشتنێکی رووکەشی لەو مەسەلە سیاسی‌یانەدا دەگەیەنن، ئەم بڕیارێکی دەرهەقی گۆرکی دەرکرد کە پتر لەدەس کێشانەوە یا لە دوورخستنەوەی لەئێش دەچوو . یاخود کۆتایی هاتنە درامایی‌یەکەی شاعیری مەزن (مایکۆفسکی ) کە هەرچەندە لە شیعرەکانیدا بەو خەونانەیدا هەڵدەدا کەبەدی هاتبوون ، کەچی کەوتە سەر ئەو رایەی کەبەدەستی خۆی کۆتایی بەژیانی خۆی بهێنێ . هەروەها ئیلیا ئەهرینکیۆرگ کە ناخی هەر وەك سە هۆڵبەندانێك مابەوە ، هەتا خۆی واتەنی لەدوای پلەی ستالینیزمەوە « سەهۆڵەکە توایەوە » ، ئەمە ئەگەرچی بەدرێژایی ژیانیشی هەر کابرایەکی سۆشیالیست بووەو لەجەنگی جیهانی‌ی دووەمیشدا بۆتە پەیامنێرێکی جەنگی لیستەکە دوورو درێژەو گەلێ ناوی گەورەو گرانی دووتوێی مێژووی ئەدەب‌و مێژووی سیاسەت پێکەوە ، نەك‌تەنیا لەرووسیادا ، بەڵکوو لە چین‌و پۆلۆنیاو چیکۆسلۆفاکیاو مەجەر دەگرێتەوە ، کە ئەمانە هەندێ لە وڵاتانی سەر بەو ڕژێمە سەراپاگیر ( شمولی ) یانەن کە ئەم جۆرە ناکۆکی‌یانەیان زیاتر تێدا دەتەقێتەوە ، وەك لە وڵاتانی سەربە ڕژێمە لیبرالی‌یەکان کە دەشێ ئەم زۆرانبازی‌یەیان بەشێوەیەکی قووڵترو فراوانترو درامایی تێدا ڕوو بداو بەڵام لە ناو گێژاوی « فرە ژمارەیی ـ التعددیە »ی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری‌ی ناو ئەو وڵاتانەدا بزر دەبێ .

ئێستا ئێمە ئامانجمان ئەوە نی‌یە کە ئایاسیاسی‌و هونەرمەند کامیان‌و تاچ رادەیەك لەسەر هەقە ؟. بەڵکوو بەبێ پێچ‌و پەنا ئامانجمان هەوڵدانی تێگەیشتنە لە تەبیعەتی هەر یەکێکیان‌و ـ رەنگە ئەو دەورەشی دەیگێڕن ـ. چونکە هەردووکیان نەك تەنیا بۆ کۆمەڵگا گرنگن ، بەڵکو بۆیەکتریش پێویستن .

ئەو پرسیارەی لێرەدا سەرهەڵدەدات ئەوەیە : ئایا راستە ئەو تەجروبانەی مرۆڤی سیاسی دەژیت وەکو ئەوانە نی‌یە کە هونەرمەند دەژیت ؟ ئایا پێویست نی‌یە مرۆڤی مامەلە لەگەڵ هێزە ناهۆشمەندانەکاندا بکات ؟ لە ناو کۆمەلە فراوانە جەماوەریەکان‌دا کاریان تێدا بکات ؟ ئایا پێویستە نی‌یە مرۆڤی سیاسی‌ی جەماوەرانەی سەرکردە بەرامبەر رووداو روالەتە دەروونیەکانی ئەو جەماوەرانە لەو پەڕی هوشیاری دابێت ؟ لەمەشی زیاتر .. ئەو کەسانەی لە ژیانی سەرکردە سیاسیەکانی ناو کۆمەڵگا هەمەجۆرو هەمەرەنگەکان دەکوڵنەوە دووپاتیدەکەنەوە کەوا ئەم سیاسیانە بەهۆی ووردبینی‌و ئەندێشەیانەوە لەواقیعی سیاسی‌و مێژوویانەوە جولانیەوە هەروەکو چۆن لە هەمان کاتدا پێویستیەکانی هۆشی عەمەلی‌یان بەجێ هێناوە ، ئەمجا ئەگەر گوترا کرداری داهێنانی هونەری بەپەیکەرو بە ئەو هۆیە دووربڕینیانەیەوە دیارە کە هەستەکان دەدوێنن ، مێژووی سیاسی لە رۆژهەڵات‌و لە رۆژئاواو ، لەکۆن‌و ئێستاش ، مرۆڤی سیاسی‌ی عەمەلی ئەوتۆ دەناسێت کە زیرەکترین نووسەری سەردەمی خۆیان بوون کەوا گەیشتوونەتە پایەی بەرزی « هونەری » لە دەربڕینی بیرو ڕاکانیان‌داو،هەندێ جاریش بەتواناترین گوتار خوێنی جەماوەری بوونە لە بەکار هێنانی هونەری رەوانبێژی‌دا !

لەگەڵ ئەمەشدا ، جیاوازیێکی قووڵ‌و دوورتر لەم هەموو لێکچوونە برچاوانە لەنێوانیان‌دا دەمێنێتەوە :

* هونەرمەنی راستەقینە بەدرێژی ژیانەکەی خۆی بەرەنگارێیکی بەردەوامی ئاشکرا یان شاراوە لەگەڵ جیهانەکەی‌دا دەکا ، گۆرگی دەیگوت : « من هاتومەتە ئەم جیهانەوە تاوەکو لەگەلیدا ناکۆك بم » ئەمەش تەنیا گورکی ناگرێتەوە بەڵکو کاروانە دوورو درێژەکەی ئەو هەموو هونەرمەندە گەورانە دەگرێتەوە کە مرۆڤایەتی ناسیویانە .

بەڵام مرۆڤی سیاسی ، یەکەم ئەرکی ئەوەیە سەرکردەی رووداوە مێژوویەکان بکات‌و لەو کارەوە دەست پێ‌بکات کە لەواقیعدا بەجێ هێنراوە ، تاوەکو نهومێك بخاتە سەر نهومێکی

تری ئاوایەکەو ، روو بەڕوو بووێ ئەو گێروگرفتە مێژووییانەی دەکەونە رێگاکەی وەکو هونەرمەند نیە کە نیشانەی لەگیان بەدەری پێوە بێت ، بەڵکو نیشانەی چارەسەری عەمەلی ، سوود بەخش، «پراگماتیکی» ئەوتۆی پێوەیە کە واتای یەکسانیو رێککەوتن دەزانێ،ئەمانەش چارەسەرەی ئەوتۆن کە هونەرمەند ناتوانێ بیکاتو لێی دوور دەکەوێتەوەو نایەوێت بیکاتو بەملکەچی واقیعو خۆبەدەستەوە دانی ئەو جیهانە دەزانێت کە بۆیە هاتوە ناوەکو لەگەڵیدا ناکۆك بێت !

* مرۆڤی سیاسیو مرۆڤی هونەرمەند وەکو یەك سەیری کات ناکەن ، راستە هەریەکەیان لەسەردەمی خۆیدا دەژیتو ، لەوانەیە شاهیدیشە لەسەری ، بەڵام شێوەکەیان زۆر لێك دوورە ، لەسروشتی مرۆڤی سیاسیو ، پێویستی دەورەکەی ئەوەیە کە هەوڵی ئەوەی دەدات بەسەر ئەو کاتەدا زاڵبێت کە دووچاری دەبێتو ، رووداوەکانی ژیانی رۆژانە بەپارچە بچووكو گەورەکانیەوە بخاتە ژێر فەرمانو خواستی خۆیو ، هەمیشە داوای ئەوەی لێ دەکرێت کە بەپێی کاری هۆو ئامانجەکانو ، پێویستیەکانی یاریی تاکتیكو ستراتیژییەوە بجولێتەوە ، بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ئەو ئایدۆلۆژیەی کە دەیجولێنێتەوە .

کات لای هونەرمەند ، بەپێچەوانەی ئەمە بەردەوامیەکی پێکەوە بەستراوە. تەوژمێکی توندو تەقیوی هەمیشەیە . گوێ نادات « ئەوشتەی روودەدات » ، « ئەوشتەی پێویستە روویدات » لای.ئەو گرنگە . زۆربەی جاران لە یاریی تاکتیكو ستراتیژیو ئەو بابەتانە ناگات ، ئەو هۆیانەی دەگەنە ئامانجەکان نازانێت ، تەنیا بیروباوەرەکان ، ئەو ئامانجانەی لەسەرەوەی واقیعی حالی حازردان ، بڕوای پاكو خاوێنو بێگەرد سەرنجی رادەکێشنو هەستو نەستە هونەرییەکەی دەبزوێنن .

* هیچ شتێك ناتوانێت هونەرمەندی راستەقینە لەگەڵ حالی حازری خۆی دا بگونجێنێو دلی پێبکەشێنێتەوە. مرۆڤی سیاسی هەرشتێك جێبەجێ دەبێ بە هەنگاوێکی بەرەوپێشەوەی ئەوتۆی دادەنێت کە نزیکی ئامانجی کاتەکی .. رادەیی مێژوویی خۆی دەخاتەوە . کەچی مرۆڤی هونەرمەند بەحەزی خۆی بێت یان بێ حەزی خۆی بێت هەردەم پەلەیەتیو ئارامینیە ، بەدوای وێنەی نایابتر .. نموونەی هەرە بەرز .. ئەو خەونەی بەجێ نەهاتوە .. دەگەڕێت ، ئەمجا لەهەر کۆمەلگەیەکدا چەندی دەسکەوت زۆریش بێ ، ئەو ماوەیەی نێوان واقیعو نموونەی هەرەبەرز هەردەمێنێ و ، ئەو خەونەی لەسەرەوەی پێویستیە رادەییە مێژووییەکانە هەر لەدەروونی هونەرمەندەکاندا بەهەرمو هاندەرو راستەقینە دەنوێنێت ، ئەو سیاسیەی کە بەهیچ هەنگاوێکی بەجێ هاتوو رازی نەبێتەو،سوودی لێ وەرنەگرێتو بە گەلەکەی نەبەخشێت ، پێویستە واز لەکاری خۆی بێنێت ، چونکە چی بە گەلەکەی بلێت ؟ کەچی ئەو هونەرمەندەی رازی دەبێتو بەرهەمەکەی دەرازێنێتەوەو وا هەست دەکات کە لەو شتەی هەیە نایابتر نابێت ، ئەمیش پێویستە واز لەکاری خۆی بنێت ، چونکە چۆن دەتوانێ خۆی لەگەڵ ئامانجو خەونە دوور ترەکانی گەلەکەیدا ببەستێتەوە ؟ .. لێرەوە .. مەزنترین کاری ئەدەبو هونەر لەجیهاندا ئەوەیە کە پێشی شۆڕشەکان هاتوتە کایەوە چونکە گشت ئەو تەزووە راستەقینەو پڕ نەرازیبوونو رەنکردنەوەی واقیعی دەردەبڕی !

ئەم لێکدووریو هاودژیەی نێوان وێنەی مرۆڤی هونەرمەندو وێنەی مرۆڤی سیاسیدا تا رادەیەك تەنیا هێلی هەر شێوەیەکیانەوە . پێویستە بلێین وێنەی هونەرمەند لێرەدا بەوێنەی ـ پێوانەیی ـ دادەنرێتو ، ئەوەی لەهەندێ قۆناغی مێژووی هونەریدا بەجێهاتوە نەك تەنیا لای ئەو هونەرمەندە رومانتیکیە گەورانەدا بووە کە سەردەمە لیبرالییەکان ناسیویانە، یاخود ئەو هونەرمەندە واقیعیە مەزنانە دا بووە کە سەردەمی ئیمە دیویەتی کە لەلایێکەوە سەردەمی مۆنۆپۆلم سەرمایەدارەکانەو لەلایەکی ترەوە سەردەمی سەراپا گیریە ئایدیولوژیەکانە ، بەڵکو لای ئەو هونەرمەندانەش بووە کە سەردەمە کلاسیکیە کۆنەکان ناسیویانەو بەرازیبوون خۆیان بەرامبەر دەسەڵاتە سیاسیەکانی ناو کۆمەڵەکانیان و ، سەیرکردنی دوا ڕۆژیان خستۆتە ناو بەرهەمەکانیانو ، شوورەو زنجیرو زۆرداریی سیاسیو فیکریو بیروباوەر رێگایانی لێ نەگرتوە .

لەلایێکی تریشەوە ، وێنەی مرۆڤی سیاسی کە هاودژی وێنەی مرۆڤی هونەرمەندە ، بێگومان وێنەی ئەو سیاسیەیە کە پیشەی سیاسەتە ئیتر گرنگ نیە لای فەرمانڕەوا بێت ئاخود هاودژی بێتو ، باش نیەو ، واقیعە بلێین هەندێ مرۆڤی سیاسی هەیە نایەوێ تەنیا بکاتە سولتە ، شۆڕشگێری راستەقینە لە سیاسەتدا وەکو هونەر وایە ، داهێنەریشە دەیەوێ زنجیرەکانی کۆمەڵکە بشکێنێت تاکو زنجیرەکانی خۆی بشکێن و ، خۆیش هەر وەکو چۆن شۆڕشگێڕێتیە رەسەنەکەی دەپارێزێت ، بەم جۆرە بەردەوام رقی لەواقیعەکە دەبێتەوەو لێی رازی نابێتو نایەوێت مامەڵەی لەگەڵدا بکات ، ئەمەش بەرێگای خۆی هونەرمەندێکە . ئەویش خەونبینێکیترە هەرچەندە تەنیا بە ئامانجە پیرۆزو خەونە پەمەیەکانی خۆی تێرنابێ .. ئەویش هاتۆتە ئەم جیهانە تاکو لەگەڵیدا ناکۆك بێت. بەڵام سەرەڕای هەموو شتێك تەنیا بەوە رازی نابێت کە لەگەڵ جیهاندا ناکۆك بێت ، بەڵکو هەمیشە هەوڵی ئەوەی دەدات کە جیهان بگۆڕێت !

وەرگێڕانو ئامادەکردنی : حسین عارف

# نهێنییەکی تری گەردوونو بەلام سامناك

**تێبینی**

**ئەم وتارە چوختەیەکی زۆر کورتی کتێبی « الـکون و الثقوب الـسوداء » ە کە لەنووسینی رؤوف وصفییەو ئەنجومەنی نیشتمانیی ڕۆشنبیریو ئەدەبیاتی کوێتی لەسالی ١٩٧٩ دا لە چاپی داوە .**

دانەری کتێبەکە هەر لەیەکەم لاپەڕەیەوە دەسپێشکەری دەکاو پێمان دەلێ :

« دەبێ ئەو زادەی خێراییو ماوەی نێوان ئەم شوێنو ئەو شوێنەی لەسەر ئەم زەمینەماندا باون لەبیر خۆمان بەرینەوە .

دەبێ چرکەو سالو بکرە درێژایی تەمەنیشمان وەك پێوانە بۆ خێراییو کات بخەینەلاوە .

دەبێ بیرو هۆشمان بخەینە پاشکۆی پرشنگێکی ڕۆژ یا ئەستێرەیەك کە ملیۆنەها میل لێمانەوە دوورە .

دەبێ ئەو بیرو هۆشەمان بەخێرایی تیشك ڕێگا ببڕێ .

ئەگەر ڕێگامان بۆ بیرو هۆشو بۆ خەیالمان خۆش کرد ئەئاوەها بەبێ سنوور ڕێگا بگرنەبەر .. ئەوسا دەتوانین بەشێك لەو دیمەنە هێجگار جوانو ڕەنگینە بێنینەبەر چاوی خۆمان کە پێ‌یدەوترێ گەردوون .

**گەردوون لەچی پێکدێ ؟**

گومانی تێدانی‌یە کە مرۆڤ لە بەردبەیانی مێژووەوە ، هەم بەخەیالێکی بەپیتو هەم بە ترسو سامو سوژدە بردنەوە،ڕوانیوێتی‌یە ئاسمانو نهێنی‌یە بێبنەکانی ، بەلام ئەو وەختە ئەو نەیتوانیوە وەك ئێستای ئێمە زانستانە لێکی بداتەوە ، بەلکوو تەنیا هێندەی لێ دەسگیر ، خستوە کە وەك ڕۆژ ژمێرێك‌یا ڕێگایەك بۆ دەسنیشانکردنی کات بەکاری بهێنێ .

بەلام وەختێ زانیاریی گەردوون ناسی پێشکەوتو بەتایبەتی دوای داهێنانی تەلسکۆب ، ئینجا مروڤ توانی ، هەردوو بەردی بناغەی گەردوون دەسنیشان بکا کە بریتین لەسەدیمو مەجەڕە . سەدیمیش یا لە تۆپەلە ئەستێرەیەك پێکدێ کە ژمارەیان بە ملیۆنەهایە ، یا لە پەلەگازێکی هێجگار گەورەو بەرین ، یاخود تێکەل لە هەردوو جۆر کە لەهەرسێ حالەتدا وەك پەلەهەورێکی زۆر زەبەللاح دێتە پێش چاو . لە کاتێکدا مەجەڕە کە بەردەسەرەکی‌یەکەی بناغەی گەردوونە و ئەمانیش ژمارەیان بەملیۆنەهایە ، هەریەکەیان لە هەزارەها ملیۆن ئەستێرەو ڕۆژو مانگو نەیزەكو شەهابو گەردو گازی‌گەردوونی پێکدێ کە هەموو بەحوکمی یاسای موگناتیزی‌یەت ، بەپێی سیستمێکی

# جەتی کاکێشانو شوێنی ڕۆژو کۆمەڵە ئەستێرەکەی تیایدا



بەکگرتووی پتەوی ڕێکو پێك ؛ بە دەوری یەکتردا هەر دەخولێن‌و دەخولێنەوە .

## ڕوبارێکی زیوین لە ئاسماندا

کە لەشەوێکی هاوینادا لەسەربان لەسەر پشت ڕادەکشێین و دەڕوانینە ئاسمان . هێڵێکمان دەکەوێتە بەرچاو کە لەڕوبارێکی زیوین دەچێ‌و بەشێوەیەکی کەوانەیی لەم ئاسۆوە هەڵدەکشێ بــۆ تەختی ئاسمان‌و بەو ئاسۆدا ڕۆدەچێتە خوارەوە . ئەو ڕوبارە زیوینــــە پێیدەوترێ خەتی کاکێشان یارێگای کاکێشان‌و بریتی‌یە لەدەستــەو دایەرەی ڕۆژەکەی خۆمان‌و ( ۱۳۰ ) سەدو سی بلیۆن ئەستێرەی تر .

جا ئەم مەجەڕەی خەتی کاکێشانەی ئێمە . قوترەکەی ســـەد هەزار ساڵی تیشکی‌یە . ( ساڵی تیشکی = ۱۸٦۰۰۰ x ۳٦٥ x ٦۰ x ٦۰ ــ میل ــ ) و کۆمەڵە ئەستێرە قەترە بەدەریاکەی ئێمە ( ڕۆژو دەستەو دایەرەکەی ) دەکەوێتە دووری‌ی ( ۳۲ ) سی‌و سێ هەزار ساڵی تیشکی لە ناوەڕاستی‌یەوە ، واتە ئاستی ( ۳/۲ ) ی ڕێگـــا لـــە ناوەڕاستی‌یەوە بۆ کەناری .

## ئایا چەند مەجەڕە لە گەردووندا هەن ؟

وتمان مەجەڕەکەی خۆمان ئەو خەتی کاکێشانەیە کــە شەوان ئاسایی بەچاو وەك ڕوبارێکی زیوین لە ئاسماندا دەیبینین‌و بریتی‌یە لە ( ۱۳۰ ) بلیۆن ئەستێرە . بەڵام ئەی ئاخۆ چەند مەجەڕەی تر لـــــە گەردوون‌دا هەن‌و هەر یەکەشیان چەند بلیۆن ئەستێرەی تێدایە ؟! .

ئەوە بوو دانەری کتێبەکە هەرزوو ئاگاداری کردین کەخەیاڵ بخەینە کارو بۆ تێگەیشتنی ئەوەی پێمانی ڕادەگەیەنێ ؛ پێوانە ئاسایی‌یەکانمان بخەینە لاوە . بەڵێ .. جگە لە مەجەڕەکەی خۆمان‌و ئـــەوەندەی بەچاکترین تەلسکۆبی ڕۆژانی ئێستامان بتوانین ببینین ، ژمـــارە خۆی دەدا لەچەند ملیۆنێك .. ئا بەڵێ .. چەند ملیۆنێك مـــەجەڕەی تر . واتە سەدو سی بلیۆن ئەستێرەی خەتی کاکێشان x چەنـــــد ملیۆنێکی تر سەدو سی بلیۆنی‌ی تر !! . جارێکی تر واتە ، نمرەیەك لەنێوان ( ۱ ــ ۹ ) دا لێرە دابنێ‌و چەندە پێت دەکرێ سفری بخـــەرە بەردەم ، ئەوە ژمارەی ئەستێرەکانی تەنیا مەجەڕەکانی نـــاو گەردوون دەردەچێ و با سەدیم‌و سەدیم کاریش لەولا بوەستێ !.

ئینجا دەبێ ئەوەش بزانین کە مەجەڕەکان ئەگەرچی وەك دانەدانەو ســەربەخۆی خۆیان ڕێك‌و پێك دەبزوێن‌و دەخولێنەوە . بەڵام لـــەناو گەردووندا دەستە دەستەو تۆپەڵ تۆپەڵ ڕیزیان گرتوە . واتە ئـــەم دەستە مەجەڕە یا ئەم تۆپەڵ بەهەزارەهایەو ئەویان یەدەیەها . بۆ نموونە خەتی کاکێشانەکەی ئێمە ئەندامی دەستە مەجەڕەیەکە ، کــە هێندەی تـــا ئێستا پێ زانرابێ بریتین لە هەژدە مەجەڕەو گەورەترینیـــــــان قوترەکەی ( ۱۳۰ ) سەدو سی هەزار ساڵی تیشکی‌یەو (۳۰۰) بلیۆن ئەستێرەی تێدایە ، لە کاتێکدا مەجەڕەکەی خۆمان قوترەکەی ( ۱۰۰ ) سەد هەزار ساڵی تیشکی‌یەو ( ۱۳٥ ) بلیۆن ئەستێرەی تێدایە . وەك لەوەبەر وتمان .

## ژیـــان لەگەردووندا

تاهێشتا ژمارەکان لەبیروهۆشتاندا گەرماو گەرمن ، من دەست‌و برد ئەم پرسیارەتان لە بەردەمدا قوت دەکەمەوە :

تکایە ئێوە خۆتان سەغڵەت مەکەن‌و هەروا ئاســـایی بـــیری لێ‌بکەنەوە . .

ئێمە لەسەر زەمینێك دەژین کە یەکێکە لە نۆ ئەستێرەی بچووك‌و لەگەڵ دوو ــ سێ نۆ پنتکە ئەستێرەی تردا کە پێیان دەوترێ مانگ‌و بە دەوری ئەو نۆیەداو ئەوانیش بە دەوری ڕوژدا دەسووڕێنەوە .

ئینجا ئەم سێ چوار نۆیە پنتکە ژمارەیەکن لـــە ( ۱۳۰ ) بلیۆن ئەستێرەی مەجەڕەیەك کە خەتی کاکێشانە .

خەتی کاکێشانەکەش بەخۆی‌و سەدو سی بلیۆن ئەستێرەکەیەوە ، برا ناونجی‌یەکی خێزانە مەجەڕەیەکی حاودنی تەنیا هەژدە برایە .

ئینجا بۆی بچۆ بۆ ملیۆنەها مەجەڕەی هەزاردها جـــار گەورەو بەرین تر لەم خەتی کاکێشانەی ئێمەو ئەوسا ئەم پرسیارە لەخۆت بکە:

ئـــایا ئـــەقڵ دەبڕێ لەناو ئەم ( ترلیۆن ترلیۆن ترلیۆن ) ئەستێرەیەی ناو گەردووندا . بەس بە تەنیا ژیان لەسەر ئەم زەمینــە نەك قەترە بەدەریا . بەڵکوو گەرد لەگەردوونەدا هەبێ‌و ئیتر ئـــەوە

ئاستی فڕو قەپەکەبێ ؟!! . لێرەدا ئیتر ئێمـــە واز لەپرسیارەکەو وەرامەکەی دێنین‌و بۆخۆتی جێ دێڵین .

**کوازەر**

ئێستا بابچینە سەر نهێنی‌یە سامناکەکە .. باسی توونێلـــە رەشەکان ..

لە سەرەتای ساڵی ( ١٩٦١ )ە وە زانایانی فەلەك کەوتنـــــە سەرنجدانی دیاردەی ئەو شـــــەپۆلە رادیۆیی‌یە بەهێـــزانەی زۆر لەدوورەوە دێن‌و دەگەنە زەمین‌و لە ئەنجامیدا پێنـــج شـــوێنیان لەگەردووندا دەسنیشانکرد کە سەرچاوەی ئەو شەپۆلانەن . ئینجـا سەیریان کرد لەو شوێنانەدا بەتەلـسکۆب هەندێ ئەستێرەی کـــز دەبینرێن‌و وەهایان دانە قەڵەم کە لە ئەستێرە دوورەکانی خـــەتی کاکێشانەکەی خۆمانن . کەچی دوایی دەرکەوت کە ئەو ئـەستێرانە هێجگار بەخێرایی دەبزوێن‌و زۆریش گەش‌و پرشنگدارن جا لەبـەر ئەوەی دڵنیابوون کە ناشێ جۆرە ئەستێرەیەکی وەك ئەوانە لـــەناو مەجەرەکەی خۆماندا هەبن‌و ئەو شەپۆلە رادیۆیی‌یە بەهێزانە بهاوێژن، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە ئەو ئەســـتێرانە دەکەونـــە کـــەناری گەردوونەوەو ناویشیان نان شێوە ئەستێرەی رادیۆیی کـــە کورت کراوەکەی ( کوازەر ) ە . ئیتر لەو وەختەوە هەتا ئێســـتا چەنـــد هەزارێکیان لێ دەسنیشانکراوە کە هەرە دوورەکەیان ( ١٠ ) دە بلیۆن ساڵی تیشکی لەئێمەوە دوورەو بەوە دەبێتە دوورترین ئەستێرەی ناو گـــەردوون لەزەمینـــەوە . هەروەهـا دەربـــارەی گەشـــی‌و پرشنگداری‌یەکەیان ، زانایان بۆ نموونە هێزی ( کوازەر ژمارە ـ ٣ ـ ٤ ـ ٤٨ ) کە چوار بلیۆن ساڵی تیشکی لە ئێمەوە دوورەو بەخێرایی ١١٠ ) سەدو دە هەزار کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا لە بزووتنیدا رێگا دەبڕێ ، دایان داناوە بەهێزی گەشی‌و تیشکداری‌ی ترلیۆنێـــك ( ملیۆن ملیۆن ) رۆژی وەك ئەوەکەی ئێمە . ئینجا هەر بەم حسابـە دەبێ قەوارەی ئەو ئەستێرانە هێندە گەورەو زەبەللاح بێ کە ئەقـــڵ بەهیچ کلۆجێك نەیبڕێ ، وەك زانای بەناوبانگ ( فرێد هۆیل ) وانەنی، تیایاندا هەبێ قوترەکەی ( ١٠ ) دە ساڵی تیشکی بێ ، واتە ( ١٠ × ٣٦٥ × ٦٠ × ٦٠ × ١٨٦٠٠٠ میل ) ئەمـــــە لەکاتێکـــــدا قوتری زەمینەکەی ئێمە ( ١٢٦٠٠ ) کیلۆمەترە .

**نهێنی‌یە سامناکەکە**

ئاشکرایە ( مادە ) لەگەردووندا ، چەندیشەیە رووکەش وەهـا نوێنێ کەسەخت‌و رەق‌و کونبڕە ، بەڵام لەراستیدا بریتی‌یە لـــــە بۆشایی‌یەکی زۆرو پوختەیەکی توندو تۆڵی کەم‌و بگرە تەنانەت ئەتۆم خۆی کە وردترین بەشی ( مادە ) یە ، هـەر ئـــەمە ســـــیفەتە ئاسایی‌یەکەیەتی . ئینجا بۆ زیاتر نزیك کردنەوەی مەبەستەکەمـــان لەتێگەیشتنەوە دەڵێین : تۆ وەرە ناوکی ئەتۆمێك تارادەی قەوارەی تۆپێکی یاری‌ی فوتبۆڵێن گەورە بکەو لەگەڵیدا ماوەی نێوان نـاوك‌و ئەلکترۆنەکانیش کە بەدەوریدا دەسووڕێنەوە بەهـــەمان نیسبەت فراوان بکە ، ئەوسا دەبینیت کەماوەی نێوان ناوکەکەو نـــزیکترین ئەلکترۆن لێ‌یەوە ( ٣٠ ) کیلۆمەترە کە ئەوە هەمووی بۆشایی‌یە .

وەکی‌تر ئێمە دەزانین کەهەر ئەستێرەیەك لـــەدایك دەبێ‌و تەمەنێك دەژی‌و دوایی دەمرێ ، بەڵام ئایا کەدێتە ســـەرمردن چی بەسەردێ ؟!. لەوەرامدا دەڵێین : دەشێ ببێتە یەکێ لەتوونێلــــە رەشەکانی ناو گەردوون .. واتە ببێتە نهێنی‌یە ســـــامناکەکە ! . چۆن ؟! .

**نەمانی بۆشایی**

ئەو ئەستێرەیەی لەوەختی مردنیدا لەچارەی دەنووســـرێ ببێتە توونێلێکی رەش ( کەهۆو مـــەرجی تایبەتی‌ی خۆی هـــەیەو لەکتێبەکەدا بەدوورو درێژی باسی لێ کراوە ) ، ئەو (مادە ) یەی لێ‌ی پێك هاتوە بە ناویەکدا هەرەس دێنێ‌و بەدوایدا قەوارەکەی بـەناو خۆیدا دەکەوێتە پەستاوتنەوەیەکی لەئەندازە بەدەر ، تاوای لێـــدێ بەملیۆنەها جار لە قەوارە ئەسڵی‌یەکەی خۆی بچووکتر دەنوێنێ . واتە بەپێ‌ی ئەو نموونەیەی لەپەرەگرافی پێشوودا بۆتانمان هێنایەوە ، وردە وردە بۆشایی هەر هیچ لە ( مادە ) کەیدا نامێنێ ، بەڵکووبرێتی دەبێ لەتەنیا تۆپەلە ناوك‌و ئەلکترۆنێکی بەناویەکتردا پەستێوتراو . ئەوسا شان بەشانی ئەم نەمانی بۆشایی‌یە لەناو ( مادە ) کەیدا، هێزە موگناتیزی‌یەکەشی بەبێ سنوور پەرە دەسێنێ‌و وای لێدێ نەبەڵێ هیچ شتێك بواری دەربازبوونی بەرەو دەرەوەی هەبێ‌و بگرە هـــەر شتێکیش نزیکی بکەوێتەوە ، بەبێ ئامان دەکەوێتـــە هـــەڵلوشین‌و راپیچ‌کردنی بەرەو ناو ورگی خۆی کەقەت پڕبوون‌و تێرخواردنی بۆ نابێ ، تاتەنانەت توانای راکێشانی فۆتۆنەکانی تیشکیش بۆ ناو ناخی خۆی‌و بەندکردنی تیایدا پەیدا دەکاو بەوە دەبێتە بەندیخانەیەك بـۆ تیشك‌و ئیتر ئەستێرە گەشە زیندوە خاوەن قەوارە گـــەورەکەی لەوەبەر ، دەبێتە تەنیا توونێلێکی رەشی تاریکی تەسك‌و تـەنگەبەرو بەڵام سامناك ، سامناك وەك گۆڕێکی کپ‌و خامۆش‌و ئەموســـتە چاو کە نەهیچ تیشکێك .. هیچ بزووتنێك .. هیچ مـادەیەکی بـەرەو دەرەوە لێ دەرباز نابێ ، بەڵکو تەنیا وەك نەهەنگێکی قەت‌و قـــەت تێر نەخۆر ، بۆ هەتایە هەر هەڵدەلووشێ . لەمەش ســەیرتر ئەوەیە کە کاتیش ( زمن ) تیایدا دەوەستێ‌و هیچ مانایەکی بـــــەو شێوەیەی ئێمە تێ‌یدەگەین تێدا نامێنێ . بەم جۆرە ئەو توونێلە رەشە تەنگەبەرە ـ ئەنجامی پاڵەپەستۆ بێ شومارو هێزە موگناتیزی‌یە لەرادە بەدەرەکەی ـ توانایەکی سامناکی وەها پەیدا دەکا کـە ئەستێرەیەکی بەملیۆنەها جار لەخۆی گەورەتر هەڵبلووشێ ، جاچ جایە کەشتی‌یەکی ئاسمانی‌ی بەدبەخت دەگا کە دەشێ لەدوا ڕۆژداو وەختێ مــــرۆڤ

دەگاتە ئەو توانایەی بەرەو قوولایی گەردوون مل بنێ ، بکەوێتە ئەم تەڵە تۆقێنەرەوە کەدەرباز بوونی لێنابێ . لەبەر ئەوە زانایان هـــەر لەئێـــستەوە کەوتوونەتە خەمخواردنی ئەو دوا ڕۆژەو دیارە مەسەلەکەش بریتی دەبێ لەوەی کە پێشـەوای کەشتی‌یەکە نەخشـەیەکی بـەیـەك بەیەکی ئەو تەڵانەی ناوگەردوونی لەبەر دەمدا بێو بزانێ چۆن خۆی لەنزیك بوونەوەیان دەپارێزێ ، ئەمە ئەگەر ـ خوانەخواســـتە ـ هەڵەیەك ڕووی نەدا ، یاتووشی ـ تەڵە ـیەکی نەزانراو نەبوو کە ئەو وەختە ئیتر هیچ چارەیەك بەدەستەوە نامێنێ ..

## نزیك گەرووی توونیلە ڕەشەکە

ئەم نهێنی‌یەی گەردوون هێشتا زانایان تەواو سەرسام دەکاو لەوە دەچێ بۆ ماوەی ساڵانێکی زۆری تری داهاتووش هەروەهـــا بمێنێتەوە ، چونکە لەنهێنی‌یە هەرە سەختو گیرەکانێتی . جاپێش ئەوەی باسی توونێلەکە خۆی بکەین ، باجارێ بزانین لە نزیکیدا چی ڕوو دەدا ؟! . بۆ ئەم مەبەستەش با کەشتی‌یەکی ئاسمانی بکـــەین بەنموونەو لەگەرووی توونێلەکەی نزیك بکەینەوە ، ئینجا با لەباری سەرنجی دوو کەسیشەوە کە یەکێکیان لە شوێنێکی هێجگار دوورەوە دەڕوانێتە توونێلەکەو ئەوی تریان لەناو کەشتی‌یەکە دایـــەو ڕووەو ناوەندی دەکشێ . با وەهاشی دابنێین کە دەتوانین لەیەك ســـاتدا بیرو ڕای هەردووکیان وەربگرین ، ئەوسا دەبینین کە ئـەوی نـــاو کەشتی‌یەکە هەست بەهیچ شتێکی نائاسایی ناکاتو سەیر دەکـــا خێرایی تیشك هەمان ژمارەکەی سەر زەمینە ( ١٨٦ هەزار میـــل چرکە ) ، لەکاتێکدا ئەوی‌تر وای دێتە پێش چاو کەتیشك لەجێ خۆی چەقیوەو لەئەنجامیدا کەشتی‌یەکەش وەها دەبینێ کـــە لەبەر دەمی توونێلەکەدا ڕاوەستاوەو لەجێی خۆی نابزوێ ، کـەچی لەڕاستیدا کەشتی‌یەکە هێجگار بەخێرایی ڕووەو گەرووی توونێلەکەو بـــۆ ناوەندی ڕۆدەچێتە خوارەوە . ئەمەش پەیوەندیی بەتیوری‌یـــە بەناوبانگەکەی ( ئەنشتاین )ەوە هەیە کە دەڵێ : کـــات بەنیسبەتی هەرشتێکەوە کە بە خێرایی‌یەکی هێجگار زۆر تێبپەڕی ، خـــاو دەبێتەوەو ئەگەریش گەیشتەڕادەی خێرایی تیشك ، ئەوا کـــات لەجێی خۆی ڕادەوەستێو ئەو مانایەی نامێنێ کە ئێمە پێیـــڕا هاتووین .

هەر بەم حسابە دەبێ بڵێین : پێویستە خێرایی ئەو شـــتەی لەگەرووی توونێلەکە نزیك دەبێتەوەو بیەوێ لە هەڵلووشـــین دەربازی ببێ ، بگاتە خێرایی تیشك ( بێگومان بەرەو دواوە ) کـــە ئەمە بەپێی تیوری‌یەکەی ئەنیشتاین قەت لە تواناداا نابێ .

## لەناو گەرووی توونێلەکەدا

ئێستا با بپرسین : ئاخۆ لەناو گەرووی توونێلەکە خۆیـدا چی هەیەو چی ڕوو دەدا ؟ . بۆ وەرامدانەوەی ئەم پرسیارە با هەر لەگەڵ کەشتی‌یە ئاسمانی‌یەکەدا ڕۆبچینە حوارەوە . ( بێگومان ئێمە خۆمان وایدادەنێین کە کەشتی‌یە بەسەلامەتی بەرەو ناو توونێلەکە دەکشێ ، دەنا هەرزوو ، واتە لەماوەی کفلەبکوونێکدا دەهاڕدرێو ڕەنگە ببێتە تەنیا گەردێك لەمادەی توونیلەکە خۆی ) .

جا کە دەگەینە جێ ( ناوەند ) دەبینین گشت مادەی توونێلە ڕەشەکە لەوێدا کەڵەکە بووەو بە مەرجێك کە ڕادەی خەشتیو هێزی موگناتیزی‌یەت تیایدا ( وەك لەوەبەر باســـمان کـــرد ) بێ‌سنوورەو هیچ شتێكو تەنانەت تیشکیش توانای دەربازبوونی بۆ دەرەوەی نی‌یە . واتە دەتوانین بڵێین : ئەو شـــوێنە لەگەردوونو گشت یاساکانی دابڕاوە . بۆ نموونە ئێمە دەزانین کـــە بچووکترین بەشی ( مادە ) ئەتۆمەو ئەتۆمیش بـــریتی‌یە لەبۆشایی‌یەکی زۆرو ڕەقەڵانی‌یەکی کەم ، بەڵام لەناو ئەو گۆڕە ڕەشەدا ، مادە ئەو سیفەتەی خۆی بزر دەکا . بەم جۆرە لەقووڵایی ئەو توونێلە ڕەشەدا، لەخێیو خامۆشی‌یەکی سامناكو کوشندە بەولاوە هیچی تری تێدا نی‌یە .

هـــەر بەم پێیە ، ئەگەر ویستمان بەبارە ڕاســـتەقینەکەدا چارەنووسی کەشتی‌یە بەدبەختەکە بزانین کە ئاخۆ چی بەسەردێ . ئەوا دەڵێین : شتێك لەو بابەتە ڕوو نادا گوایە خۆی پێدا بـــداو هەپروون بە هەپروون ببێ وەك ئەوەی خۆی بدا بەڕووی مانگـــدا ـ نەء .. بەڵکوو ڕاست ڕووەو ناوەندەکەی دەکشێو لەماوەی چـــرو ترووکانێکدا دەبێ بەگەردێکی مادەی توونێلەکە ( وەك وتمان ) ، بـــەڵام گەردێکی ئەوتۆ کە بریتی دەبێ لەتەواوی بوختەی ( مـــادە ) کەی .



توونێلێکی ڕەش ئەستێرەیەکی زەبەللاح هەڵدەلووشێ

## توونێله ڕەشەی ( مامر ئێکس/۱) ئەستێرەی ژمارە ( همدا ۲۲٦۸٦۸ ) بۆ ناو خۆی ڕادەکێشێ

چونکە زانیارییەکە لەبنەڕەتدا لەجۆرەکانی پرشنگی تیشکەکەدایە وەك ( گاما ، ئێکس ، سەروو بنەوشەیی ، خواروی سوورو شەپۆلی رادیۆیی ) .

ئینجا وەختێ لەرێگەی ئەم شیکردنەوەی تیشکەوە ، رادەی درەوشانەوەو پلەی گەرمایی ئەستێرەکەمان لا ئاشکرا دەبێ.دەکەوینە سەرنجدانی چۆنێتی گۆڕانی رەنگەکان بەپێی ریزبوونیان لەخانەکانی ( پەلکە زێرینە )دا . واتە ئەستێرەکە لەسووڕانەوەیدا بەدەوری هاوەڵە نەبینراوەکەیدا ، ئەگەر بەرەو زەمینەکەی ئێمە بروا ، ئەوا رەنگەکان روو لەشین دەکەن . یا ئەگەر کەوتە نێوان زەمین‌و هاوەڵەکەیەوە هیچ گۆڕانێکیان تێدا روونادا . بەڵام ئەگەر کەوتە ئەودیوی هاوەڵەکەیەوە ئەوا روو لە سوور دەکەن . بەم جۆرە زانایان دێنە سەر ئەو باوەڕەی کەدەشێ شتە نەبینراوەکە ، بەکێك بێ لەو تەڵە گەردوونییانە .

### پرشنگی ( ئێکس ) رێگایەکی ترە

زانایانی فەلەك بۆیان دەرکەوتوە ، هەر جۆرە گازو گەردێکی گەردوونی کە لەتوونێلێکی رەش نزیك دەبێتەوە ، بەهۆی موگناتیزییەتە هێجگار بە هێزەکەیەوە ، بەناویەکدا دەپەستاوترێ‌و ئەوسا پلەی گەرمایییەکەی هێندە بەرز دەبێتەوە کە لە شێوەی گەردەلولێکدا بەرەو ناو توونێلەکە خۆی دەکوترێ‌و لەئەنجامیدا پێش ئەوەی بگاتە ئاستی گەرووی توونێلەکە ، بڕوچان پرشنگی ( ئێکس ) دەهاوێژێ‌و ئیتر ئەوە دەبێتە نیشانەیەکی تر بۆ بوونی توونێلێکی رەش لەو شوێنەی گەردووندا .

### یەکەم توونێلی رەش کە دۆزرایەوە

حیکایەتەکەی لەساڵی ۱۹٦٥ دا دەس پێدەکا . لەو ساڵەدا لەرێگەی پرشنگی ( ئێکس )ەوە ، بۆ یەکەمجار ئەستێرەی ( مامر – x – ۱ ) دۆزرایەوە کە ئەگەرچی لە سنووری خەتی کاکێشانەکەی خۆماندایە ، بەڵام بە بەهێزترین تەلسکۆب بەچاو نابینرێ .

لەساڵی ۱۹٦۹ دا بەهۆی گۆڕانی شێوەی پرشنگە ئێکسەکەیەوە ، زانیارییەکی فراوانتری دەربارە دەسگیر خرا . ئینجا لەساڵی۱۹۷۱ و ۱۹۷۲ دا ، بەهۆی مانگی دەسکرد ( ئۆهۆرۆ )وە سەیر کرا هاویشتنی پرشنگی ئێکس لەئەستێرەکەوە روو لەکزی دەکاو لەناکاوێکیشدا هەر لەهەمان شوێندا سەرچاوەیەکی شەپۆلی رادیۆیی پەیدا بوو . بەدوایدا بەهێزترین دووربینی رادیۆیی بۆ دەسنیشانکردنی ئەو سەرچاوەیە خرایە کار ، بەڵام سوودی نەبوو . کەچی دوایی‌تر دەرکەوت کە هەردووکیان ( پرشنگە ئێکسەکەو



واتە بەبێ بۆشایی نێوان ئەتۆمەکانی ) . ئینجا دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەگەر بتەوێ کەشتییەکە لەو شێوەی مادە پوختەییەدا ببینیەوە ، ئەوا بەهێزترین میکرۆسکۆب کە لەتوانایدا هەبێ سەدەها هەزار جار بۆتی گەورە بکا ، هێشتا دادت نادا .

### ئەم تەڵە گەردوونییە چۆن دەسنیشان دەکرێ ؟.

لەبەر ئەوەی توونێلە رەشەکان بەهیچ کلۆجێ نابینرێن ، زانایان لەدۆزینەوەو دەسنیشانکردنی شوێنەکانیان لەگەردووندا ، تووشی زەحمەتییەکی زۆر دێن . کەوابێ چۆنیان دەدۆزنەوە ؟! . لە راستیدا ئەوە زیاتر بەهۆی هەندێ دیاردەوە دەکرێ کە لەدەورو پشتیاندا روو دەدەن . لەوانە توانای هەڵلووشینی ئەو شتانەی لێیان نزیك دەبنەوە ، یا بەگرهێنان‌و سووڕاندنەوەی ئەستێرەی ئەوتۆ بە دەوری خۆیاندا کە ملیۆنەها جار لەخۆیان گەورەترن . واتە ئەگەر سەیر کرا ئەستێرەیەك بەدەوری شتێکدا دەخولێتەوەکە ناتوانرێ ببینرێ ، ئەوا ئەو شتە بە زۆری توونێلێکی رەشە . بەڵام ئایا ئەم دیاردەیەمان بەچی بۆ دەسەلمێ ، بەتایبەتی ئەگەر هەزارەها ساڵی تیشکی لێمانەوە دوور بێ ؟! . بۆ ئەم مەبەستە پەنا دەبەنە بەر شی کردنەوەی تیشکی ئەستێرەکە بەپێی درێژایی شەپۆلەکانی کە لەم رێگەیەوە زانیارییەکی باشمان دەربارەی دەسگیر دەبێ ،




**چونێتی‌ی دروستبوونی توونێلێکی رەش :**
**١ ـ بەرەو ناوەندی توونێلەکە**
**٢ ـ قەراغی توونێلەکە**
**٣ ـ کات**
**٤ ـ تیشکێکی بەندکراو**
**٥ ـ ئەو شتەی بۆ ناوەوە مل دەنێ**
**٦ ـ کات**
**٧ ـ بۆشایی ئاسمان**

شەپۆلە رادیۆیی‌یەکان ) لەیەك سەرچاوەوە دەردەچن .

بەم جۆرە زانایان لەوە دڵنیابوون کە ئەستێرەیەکی هێجگار زەبەللاح هەیەو بەدەوری ( مامر ـ x ـ ١ ) دا دەسووڕێتەوەو بەپێ‌ی کەتالۆگەکەی زانا ( هێنری درابەر ) ناونرا ( ه ـ د ـ ا ـ ٢٢٦٨٦٨ ) کە ( ٦٥٠٠ ) ساڵی تیشکی لەئێمەوە دوورە . هەر وەکوو لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٢ دا توانرا ئەستێرە زەبەللاحەکە بەدووربینی رادیۆیی ببینرێ‌و دەرکەوت قەبارەکەی ( ٣٠ ) ئەوەندەی قەبارەی رۆژەکەی لەمەڕ خۆمانە .

کەوابێ ( مامر ـ x ـ ١ ) توونێلێکی رەشەو لە نـاو مەجەرەی خەتی کاکێشانەکەی خۆماندایە و ئـەو ئەستێرە زەبەللاحـەی بەگیرهێناوەو کەوتۆتە هەڵلووشینی . ئەمەش بەدەلالەتی پرشنگی ئێکس‌و شەپۆلە رادیۆیی‌یەکانیان لەگەڵ گۆڕانی رەنگەکانی تیشکی ئەستێرەکەدا .

**دواجار ، لە ( تانگوسکا ) چی رووی‌دا ؟!**

زانایان هەتا ئێستاش سەریان لەو کارەساتە سوڕماوە کە لەسەعات حەوت‌و نیوی سەر لەبەیانی‌ی رۆژی ( ٣٠ ) ی حوزەیرانی ساڵی ( ١٩٠٨ ) دا لە زەلکاوەکانی ( تانگۆسکا ) لەباکووری سیبریادا رووی‌دا . لەو وەخت‌و سەعاتەدا خەڵکەکە لەبەرینی‌ی ناوچەیەکدا بە قوتری ( ١٢٨٠ ) کیلۆمەتر ، گوێیان لەتەقینەوەیەکی سامناك بوو کە دوایی دەرکەوت دارو درەخت‌و ئاژەڵێکی زۆری دەورو بەری ناوەندی تەقینەوەکەی فەوتاندوە .

خەڵکەکە وەهایان گفتدا کە لەناکاوێکدا شتێکی گەشی شین‌باویان بەسەر سەریانەوە دیوەو بەدەم کەوتنی‌یەوە بەردەوام ئاگری لێ باریوە . سەیر ئەوەیە کەسێك لەوەختی خۆیدا بۆ ساغ کردنەوەی کارەساتەکە بەپیرەوە نەچوو ، بەڵکوو دوای نۆزدە ساڵ ئینجا دەستەیەك لەزانایان روویان کردە ناوچەکەو بەڵام لەسەرسوڕمان بەولاوە هیچیان دەسگیر نەبوو . ئیتر لەو وەختەوە لەسەری بووە دەمەتەقێ‌و گفت‌و گۆیەکی زۆری بێ ئەنجام ، تا لەساڵی ١٩٧٢ دا زانایان ( جاکسۆن و رایان ) وتارێکیان لەگۆڤاری ( سروشت ) دا بلاوکردەوەو بۆ یەکەمجار ئیشارەتیان بەوەدا کە ئەو کارەساتەی (تانگۆسکا) ، بریتی بووە لە توونێلێکی رەش کە قوترەکەی لەیەك لەسەر ملیۆنی سانتی مەترێك بەولاوە نەبووە و لەو شوێنەدا خۆی بەزەمیندا داوە ، بەڵام بەوەی باش بووە خێرایی‌یەکەی هێندە لەرادە بەدەر بووە کە ئانو سات زەمینی کوناودە / کردوەو لەو دیوی‌یەوە بەرەو قووڵایی گەردوون تێ‌ی تەقاندۆتەوە . بەواتایەکی تر ئەگەر لەناویدا بمایەتەوە ، ئەوا وردە وردە زەمینەکەی ئێمەی هەڵدەلووشی‌و رۆژی حەشرەکەش دادەهات .




**پەڵە رەش‌باوەکە خەتی کاکێشانەکەی لەمەڕ خۆمانە**

**سعيد يحيى خطاط**

**مەبەست لەشەڕی سایکۆلۆجی ، کارتێکردنە سـەربیرو هەستو جوولانەوەی کۆمەڵێك یاچەند دەوڵـەتێکە لەلایەن دەوڵەتێ یاچەند دەوڵەتانی ترەوە ، بەپێی پلانێکی نەخشـە بۆکێشراو بەجۆرێك کە خزمەتی ئەو ئەنجامانە بکات کـە بۆی هاتۆتە کایەوە .**

ئەم شەڕەیش تەنیا بەپروپاگەندە ناکرێت و چەند شێوەی دیکەیشی هەن . « پۆل لاینبێرگەر » پێی وایـە شـەڕی سایکۆلۆجی بریتی‌یە لە بەکار هێنانی پروپاگەندە و دەنگوباس شان بەشانی جوولانەوەی سەربازی و ئابووریو سـیاسی بەمەبەستی بۆ جەنگ خۆ ئامادەکردنو کارتێکردنە سـەر سیاسەتو رۆشنبیریو نانەوەی ترسو نارەحەتیو شتی‌تر بۆ ئەم کارەش هەرچی لە ئیمکاندا بێ ئەنجام دەدرێ وەك ژەهـراو کردنی خۆراكو لەناوبردنی پێوەندیی بازرگانیـەتی دەرەوەو تێکدانی کارگەو پیشەسازی ، کە دەبێتە هۆی نزم بوونەوەی رەوشتو ورە .

مەرج نیە شەڕی سایکۆلۆجی تەنیا لەکاتی جەنگدا بەکاربێت و مەرجیش نیە هەربۆ دوژمن‌بێ ، بەڵکو دژی وڵاتە بێ‌لایەنو دۆستەکانیش ئەنجام دەدرێ . بۆ بەڵگە لە ساڵی 1942 دا واتە لە گەرمەی جەنگی دووەمی جیهاندا ، ئەمریکا چەند دەزگایەکی پروپاگەندەی پێك هێنا وەك: نووسینگەی راگەیاندنی سەربازیو نووسینگەی راستیو سەرژمێر کردنو نووسینگەی بەڕێوەبردنی بەپەلەو هەندێ ئاژانسی دەنگوباسو نووسینگەی دیکەی سـەر بەسوپا .. پاشان کەشەڕ کۆتایی هات ، هەمان دەزگا دووبارە دامەزرانەوەو لەلایەن وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمریکا «جۆن فۆستەر دالاس » سەرکردایەتی شەڕی سـایکۆلۆجی لەکاتی ئاشتیدا دەکرا . هـەروەها رژێمی « هێتلـەر » شـەڕی سایکۆلۆجی‌ی دژی گەلی ئەڵەمان لەبواری پروپاگەندەی درۆو بڵاوکردنەوەی ترس وەك : دەبێ گەلی ئەڵەمان ببێتە گوللە تۆپ بتەقێندرێ . داگیرکردنی پۆلەنداو چیکۆسلۆڤاکیاو بەشێکی یەکێتی‌ی سۆڤیەت بۆ دەست بەسەر داگرتنە سەر ئەو گەلانەو بەکار هێنانیان بوو لە پێناو پیشەسازی‌ی جەنگو بەرهـەم هێنانی چەكو تەقەمەنی . لەوڵاتە بێ‌لایەنەکانی وەك سویسراو سوید ، پیشەی کرێ گرتەکانی ئەڵەمان ئەوەبوو ئەم دەوڵەتانـە ( لەژێر باری ترسدا ) پێویستی‌یەکانی جەنگ جێ بەجێ بکەن و نیسبەت بەوڵاتە دۆستەکانی وەك ئیتالیاو یابان هـەربۆیە بوو کەئەم دەوڵەتانە بەردەوام‌بن لەسەر یەکگرتن و یارمەتی .

لەدوای جەنگی دووەمی جیهان و رزگـار بوونی زۆربەی زۆری میللەتانو بەدی هێنانی سـەربەستی لەچوارچێوەی سنوورێکی دیارکراودا ، داگیرکەر و ئیمپریالیزم زیاتر هەوڵو تەقەلایاندا لەپێناو وەرگرتنەوەی بەرژەوەندی‌ی تایبـەت بەشڵەژاو کردنی بەرهەمو ئابووری‌ی نیشتمانیو هێرش بردنە سەر رۆشنبیریو کەلەپوورو خستنەکاری پارەو دراوێکی بەجگەر زۆر بۆ ئەم مەبەستە . لەم دەوڵەتە ئیمپریالی‌یانە ئـەمریکا ئالاهەلگری شەڕی سایکۆلۆجی‌یە . بەتایبەتی کـە بارودۆخی گونجاوە لەرووی ئابوری‌یەوە . لەهەمان کاتدا ئەمریکا ئاشکرای کردوە کە دڕندەترینو چەپەڵترین ئیمپریالیزمی جیهانەو دەست دەخاتە نێو کاروباری ناوخۆی دەوڵـەتانو پاڵپشتی رژێمی کۆنەپەرستو دیکتاتۆرو شۆڤینی دەکاتو ناوە ناوەیش شـەڕ لەگەڵ دەوڵەتانی سەربەخۆ بەرپا دەکات . « جێمس بۆرنهـام » لەکتێبەکەی ناوی ناوە « خەبات لە پێناو جیهان » دا دەڵێ := ئامانجمان دروستکردنی دەوڵەتێکی ئـەمریکایی جیهانی‌یە ، بارودوخێکی ئەوتۆی هەبێ بتوانێ چاودێری هـەموو وڵاتانی جیهان بکات ـ .

دەزگاکانی شەڕی سایکۆلۆجیو سیستەمی پروپاگەندەی ئەمریکا بۆ ناوخۆی وڵات ئەو دەنگوباسە هەڵدەبژێرن کە لەگەڵ بەرژەوەندی ئەوان بگونجێو دەنگوباسی تر پشت‌گوێ دەخرێنو تەنیا لێپرسراوەکان ئاگادار دەبنو لەجیاتی ئەوە دەنگوباسـی سووكو سادە بۆ هاونیشتمانی ئەمریکایی بڵاودەکەنەوەو لـە کاروباری سیاسی دوور دەخرێتەوەو بەندی چەند رووداوێکی دیکەی دەکەن وەك بینینی فلیمی‌ترسو وێرانکاریو گوێدانـە راپۆرتی رۆژانەی پۆلیسی سەبارەت بەتاوان و پیـاو کوشتنو دەنگوباسی دادگا کە بەشێوەیەکی رێکوپێکی رۆژانە لە ئێزگـەو تەلەفزیۆندا بڵاو دەکرێنەوە . هەروەها ئەم دەزگایانە باسی دراو تەرخانکردن بۆ کاروباری سەربازی دەکەن ، کـە گوایە بـۆ پاراستنی ئەمریکاو بەرژەوەندی‌یە گرنگەکانی ئەمریکایـە بەتایبەتی دوای رووداوی سیاسی لەهەر وڵاتێك بێت .

ئەوەی شایانی باسکردن بێت ئەمەیە ، کە زۆربەی زۆری گەورە پیاوەکانی ئەمریکا بەر لەوەرگرتنی فەرمانڕەوایی شوێنی دیارو ناسراویان بووە لە ئیحتیکارات .. بۆ نموونە « رۆبەرت مەکنەمارا » پێش ئەوەی بکرێتە وەزیری بەرگری ، کۆمپانیای بەرهەم هێنەری ئۆتۆمبێلی « فۆرد » ی بەڕێوە دەبردو دوای وەزیریشی کرایە سەرۆکی بانقی ئاوەدانی‌ی دەوڵەتان . واتـە دەزگاکانی بڵاوکردنەوەو شەڕی سایکۆلۆجی پێوەندی‌ی راستەو خۆیان بە کارتلو سـەرمایەدارەکانەوە هەیەو یەکڕاست لەلایەن ئەوانەوە سەرپەرشتی دەکرێنو دراویان بۆ تەرخان دەکرێ وەك کۆمپانیای « دوبۆنت » و کۆمپانیای « ژنرال مۆتۆرز » کـە گەورەترین کارخانەی ئۆتۆمبێل و تانکی سـەربازی هـەیەو لەدروستکردنی ئەو بۆمبا ئەتۆمەی خـرایە سـەرهیرۆشیما بەشداری کردبوو .

سـەرمایەدارەکانی ئەمریکا بۆ ئەوەی کۆمەڵیان ببرێتە ڕێوەو بەرژەوەندی چینایەتیان بپارێزرێ ، دەبێ پایەی ئەم رژێمە قایم بکەن چ بەسەلماندنو چ بەچەسپاندنەسەر ، یا بەهەردوو رێگـا بێت . یاوەك تیۆرزانی ئەمریکا ( داونسون ) دەڵێ : لە کۆمەڵی

ئێمەدا پروپاگەندە بۆ ئەمەیە توانای بیرکردنەوەی خەڵك بەند بکرێت بەفێڵ یا بەراستی گۆڕین و شتی‌تر . « هیو کارلتۆن گرین » کۆنە بەڕێوەبەری دەستەی ئێزگەی ئینگلترا دەڵێ : « ئێمە ئەگەر پێویستی ئەو خەڵکانەی لەوڵاتە تازە پێگەیشتووەکاندا دەژین ـ ئاسیا ، ئەفریقیا ، ئەمریکای لاتین ـ جێ‌بەجێ نەکەین، رەنگە لەشوێنی دیکە بەدوای ئامانج بگەڕێن‌و زیان بەخشێتە خۆمانەوە » .

لە دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، دەزگای شەڕی سایکۆلۆجی گۆڤارو رۆژنامەو ئێزگەو کتێب‌و فلیمی سینەما بڵاودەکاتەوە . بەر لەشەڕی حوزەیرانی سالی ١٩٦٧ کە لەناوچەی عەرەب نشین رووی‌دا ، ئەم دەزگایانە بەو پەڕی سەربەستی چالاکی‌یان دەنواندو بارو دۆخی گونجاویان بۆ ئەو شەڕە ئامادە دەکرد ! بۆ نموونە دەزگای یەکگرتووی بڵاوکردنەوەو دانان‌و گۆڕین‌و کۆمپانیای چاپەمەنی چەند گۆڤاری «سوپەرمان» و « سیخوڕەکان » و چەند گۆڤارێکی دیکەی منداڵان .

لە « میسر » دا لە سالی ١٩٤٣ یەوە تا سالی ١٩٤٨ ەوە گۆڤاری « المختار » بڵاودەکرایەوە ، پاشان دووبارە لە سالی ١٩٥٦ ەوە بڵاوکرایەوە. ئەم گۆڤارە راستەو خۆ پروپاگەندەی بۆ سوپای ئەمریکا دەکرد کە گوایە قەڵای ئاشتی‌و پارێزگاری سەربەستی‌و ئازادی‌یە ! . لە سالی ١٩٥٣ دا دەزگای « فرانکلین » لقێکی لە قاهیرە کردەوە وەك یەکەم لقی ئەم دەزگایە لە دەرەوەی ئەمریکادا(١) لە هەمان کاتدا تاقمێك کۆمەڵێکیان بەناوی ( برج المراقبه ) دامەزراندو ئەندامیان لە خەڵکی میسرو هی دەرەوە وەردەگرت‌و ناویان دەنان « شایەتەکانی یەهوە »(٢) و دەستەی کێژوکاڵی تەمەن بیست ساڵ‌و خوارتر بەدەستێك ئینجیل‌و بەدەستی تر بڵاوکراوەو چاپەمەنی بەزمانی عەرەبیان دەبردە کووچەو کۆڵانی شارەکان‌و پروپاگەندەیان دژی رژێم‌و کاربەدەستان بڵاو دەکردەوە .

لە دەزگا هەرە گرنگەکانی شەڕی سایکۆلۆجی « ئاژانسی پرسگەی ئەمریکا » یە ـ یونایتد ستایشن ئینفۆرمێشن سێرڤیس USIA ـ . ئەم ئاژانسە لە سالی ١٩٥٣ و دوا بە دوای شەڕی کۆریا دامەزرا بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی وێنەی ژیانی ناوەوەی ئەمریکا بەو شێوەیەی کارتلی سەرمایەداری نەخشەی بۆ کێشاوە . سەرچاوەی زانستی‌و دەنگوباسی ئەم ئاژانسە ، ئەنجومەنی رێکخستن‌و ئاژانسی سیخوڕایەتی ئەمریکایەو لەزۆربەی زۆری گۆشەکانی جیهاندا لە ژێر پەردەی رۆشنبیری‌و یارمەتی دەوڵەتە تازە پێ گەیشتووکانەوە نووسینگەی کردۆتەوە و چەند گۆڤارو رۆژنامەو بڵاوکراوە بەزمانی هەمە جۆر دەردەکات(٣) . ئەم ئاژانسە بایەخێکی تەواوی دەدرێتێ و یەکسەر لەلایەن ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوایەتی ئەمریکا سەرپەرشتی دەکرێ‌و دەزگاکانی سەر بەم .

ئاژانسە دەنگوباس بەو شێوەیەی کاریگەر بێت بڵاو دەکەنەوەو بەزۆری باسی چەکی شەڕو دڵداری‌و ئەکتەری سینەماو کوشتن‌و تاوانی سەیرو سەمەرە دەکەن .

لەپاڵ چاپەمەنیدا ، ئاژانسی پرسگەی ئەمریکا بایەخ بەئێزگە دەدات‌و ئەوەندەی کردۆتەوە کە لەهەموو قوژبنێکی جیهان ببیسترێ :

**١ ـ ئێزگە ناسراوەکانی سەر بەدەوڵەت وەك**
« ئێزگەی دەنگی ئەمریکا » کە بەگەورەترین دەزگای ئێزگەی ئەمریکا دەژمێردرێ‌و بەرنامەکانی بەرەو رۆژهەڵات‌و ناوچەی دەریای ناوەندی دەنێردرێن . ئەم ئێزگەیە لە سالی ١٩٥٢ دا لەسەر کەشتی‌یەك دامەزراو بە ١٢ زمان بەرنامە بڵاودەکاتەوە وەك عەرەبی‌و تورکی‌و فارسی‌و بلگاری‌و ئەرمەنی‌و ئەلبانی‌و هەندێ جار پێوەندی راستەو خۆ بەمەڵبەندی سەرەکی‌ی ئێزگە دەکات لەواشنتۆن .

**٢ ـ هەندێ ئێزگە هەن دەیانگوترێتێ «ئێزگەی تایبەتی»**
وەك (ئێزگەی ئازادی ئەوروپا ) کە لە سالی ١٩٤٩ لە شاری « میۆنیخ » دا بەسەرۆکایەتی ژنرال « گرتینگر » و لەپێناو نەخشە دانانی شەڕی سایکۆلۆجی دژی وڵاتە سۆشیالیستەکان دامەزرا .
لەم ئێزگەیەدا زیاتر لە ١٥٠٠ فەرمانبەرو کرێکارو کادری هونەری کاردەکەن و پتر لە ٥٠ بەرنامەی ئاراستە کراوی چیکۆسلۆڤاکیا و پۆلەنداو رۆمانیای هەیەو باوەڕ پێکراوێکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا سەرپەرشتی دەکات . لە هەندێ کاتدا دەبێتە بنکەی هێزەکانی دژ بە دەوڵەتە سۆشیالیستەکان‌و بەرنامە بۆ دەوڵەتێك ئاراستە دەکات کە گوایە ئێزگەکە لەزەوی‌ی ئەو دەوڵەتەدایە و مولکی کەسانی ناحەزو دژ بەو رژێمەن ، وەك ئەو ئێزگەی ناونرابوو ( لێژنەی هەنگاریای شۆڕشگێر ) دوای هەوڵی بەرپاکردنی کودەتای سالی ١٩٥٦.

**٣ ـ ئێزگەی سەربەستی ـ رادیۆ لیبیرتی**
لە ئێزگە تایبەتەکانی سەر بەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایەو لەلایەن « لێژنەی ئەمریکایی بۆ رزگارکردن لەبەلشەوی » لە شاری « میۆنیخ » بەڕێوە دەبردرێ . شەپۆلەکانی ئەم ئێزگەیە ئاراستەی یەکێتی‌ی سۆڤیەت کراون‌و بەزمانی نەتەوەکانی سۆڤیەت بڵاودەکرێنەوە و ئامۆژگایەکی لێکۆڵینەوەو کۆکردنەوەی دەنگوباس‌و نووسینەوەی هەیە .

**٤ ـ ئێزگەی ریاس** Rias
ئەم ئێزگەیە لە سالی ١٩٤٦ دا لەلایەن وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە بەرلینی رۆژئاوا دامەزرا . نیوەی بووجەی دەوڵەتی ئەمریکاو نیوەکەی تریش دامەزراوی فرود ـ رۆکفیلەر و دامەزراوی کارنیجی دەیدەن . ئێزگەکە دژی ئەڵەمانیای

دیموکرات تەرخان کراوەو ژمارەیەك لەپسپۆرانی ئەمریکا بەناز ناوی شاراوە شان بەشانی سەدان مووچە خۆری ئەلەمانیای رۆژ ئاوا بەرێوە دەچن . بەشی سیاسی لە بەشە سەرەکی‌یەکانی ئەم ئێزگەیەو ئەم هۆبانەی لێ‌جیا دەبێتەوە :

**١ ـ لە ساڵی ١٩٦٧ دا لە شاری « تەنجە »ی مەغریب بناغەی زانکۆیەکی ئەمریکایی دامەزرا شان بەشانی هەردوو زانکۆی لە قاهیرەو بیروتدا هەن . ئەم زانکۆیانە یارمەتی‌و دراویان لە دەزگا سیخوریەکانی ئەمریکا بۆ دێت وەك دامەزراوی « فۆرد » .**

**٢ ـ وەك لە تەوراتدا هاتوە « یەهوە » بەزمانی جوولەکە ناوی خوایە . دوا بەدوای شەری ١٩٦٧ ی نێوان عەرەب‌و زایۆنیزم ئەندامانی ئەم کۆمەڵە درانە دادگا . پاش لێکۆڵینەوە دەرکەوت کە مەڵبەندی گشتی‌ی کۆمەڵ دەکەوێتە شاری ( برۆکلین ) و لەلایەن ئاژانسی سیخورایەتی ئەمریکا ( SIA ) سەرپەرشتی دەکرێ .**

**٣ ـ لەو بلاوکراوانەی لەولاتە عەرەبی‌یەکاندا ناوبانگیان دەرکردبێ گۆڤاری « ژیان لەئەمریکادا » بوو . لە شاری کەرکووکدا تا شۆڕشی ١٤ تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ بلاوکراوەی « پەیام » بەزمانی کوردی دەر دەچوو .**

**١ ـ سیاسەتی ناوخۆ .**
**٢ ـ سوپای گەلی ئەڵەمانو سوپای سۆڤیەت .**
**٣ ـ هۆبەی ئابووری و پیشە سازی .**
**٤ ـ هۆبەی حیزب و رێکخراوە جەماوەری‌یەکان .**

هەروەکو لە پێشتریش گوتمان ، ئیشوکاری ئەم دەزگایانە تەنیا بلاوکردنەوەی دەنگوباس و لێکۆڵینەوە نیە ، بەڵکو بوونەتە مەڵبەندی وێرانکاری‌و سیخوڕایەتی‌و هوشیارکردنەوەی کرێگرتەکان بەهۆی « جفرە » بۆ دەست خستنە ناو کاروباری ناوخۆی ئەو دەوڵەتە سەربەخۆیانەی سیاسەتیان ناگونجێ لەگەڵ سیاسەتی چەوت‌و چاو چنۆکی ئەمریکا و رژێمە ئیمپریالیزم‌و سەرمایە دارەکان .

ئەمە بەشێکی زۆر کەمی کەرەستەکانی شەڕی سایکۆلۆجین ، کە ئەمریکا لەپێناو ئامانجە نارەواکانی بەکاریان دێنێ وەك دروستکردنی شەڕی ناوخۆو کودەتاو ئاژاوە و بلاوکردنەوەی برسێتی‌و نەخۆشی‌و هەژاری بۆ ئەوەی بازاڕی سەرمایەدارو بۆرژوا لە گەرمەو هەرمێنداین .

**سەرچاوەکان :**

**١ ـ دراسات فی الاعلام والحرب النفسیه ـ د. فرید آیـار .**

**٢ ـ الصحافه التلفزیونیه گۆرینی ابتسام عباس علوان .**

**٣ ـ گۆڤاری « الآداب »ی بیروتی ژمارەی تایبەت بە کۆنگرەی نووسەرانی ئاسیاو ئەفریقیا ساڵی ١٩٦٦ .**

# بایەخ دان وگرنگ دان بەفۆلکلۆر و رەسەنایەتی فۆلکلۆر

د . سوکریە رەسول

گومان لەوەدا نییە کە رۆشنبیری هەر نەتەوەیەك لە دوو بەشی بنچینەیی پێك دێت . یەکێکیان ! ئەدەبی سەر زاری‌یە کە هەمیشە و هەردەم دەگۆڕێ و بەردەوام لەناو خەلکە کە بلاو دەبێتەوە . ئەمەش کەرەسەی لێکۆلینەوەی فولکلورە .

دووهەم : کەرەسەی لێکۆڵینەوەی مێژوویی ئەو ئەدەبەیە کــە نووسراوو چەسپاوە . لەراستی‌دا بەشە سەر زاری‌یەکــە خــۆی لەخۆیدا رۆشنبیری گەل و کۆمەڵ دەنوێنێ کە زوربەی بەشەکانی ئەم بابەتە بەباشی‌و رێگایەکی زانستیانە تۆمــــار نەکــراوەو هەتـــــا لێکۆڵینەوەیشی دەربارە نەکراوە . ئەو بەشانەی کە کۆکراوەتەوەو لێکۆڵینەوەیشی دەربارە کراوە هێشتا سەرەتایەو لێکداونەوەیەکی ئەکادیمیانە نەکراوە .

لە کوردستاندا تاکو ئێستا زۆربەی زۆری بەشـــەکانی فۆلکلۆر لێکۆڵینەوەی دەربارە نەکراوەو هەتا هەندێ بابەتی فولکلۆریش هەن هێشتا دەستی لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەیان نەگەیشتوێ‌و لە زۆربەی ناوچە جیاوازیەکانی کوردستانیشدا کۆکردنەوەیەکی هەرەوەزی مەیدانی بۆ نەکراوە . خۆ ئەگەر بەراووردی ئەو کەرەسانەش بکــەین

کە دەربارەی فولکلۆر کراوە دەبینین لە چەندین کتێب و نامیلکــــە تێپەر ناکات .. بۆیە دەڵێین لە کوردستاندا بەشــــێوەیەکی گشتی لەگــەل بایەخدان لە رێگەی گۆڤارو رۆژنامــەو ئێزگــەو هۆیـــــە راگەیاندەرەکانی تری رۆشنبیری ئەم لایەنە هێشتا کۆنەکراوەتەوە و زۆربەی زۆریشی لێکۆڵینەوەی دەربارە نەکراوە ..

لەگەل گرنگی و بایەخدان بەم بابەتە لەرووی زینـــدووکردنەوەی سامانی نەتەوایەتی‌دا ئەم بەشە بەبەشێکی گەوردی کەلەپوری گــەل دا دەنرێ . فولکلۆر هەمیشە پارێزگاری لەرەسانەیەتی رەگەزەکــانی خۆی کردووە . پارێزگاری لەسێوەو جۆرو چەشنی لەرووی داهێنانی هونەری‌یەوە کردووە . ئەم سامانە لەرووی مێـــژوویی‌یەوە نــــرخ و جێگایەکی تایبەی لەرەسانەیەتیـــدا بووە .. دەنگی رابـــووردوو و ئێستایە ..

ئەگەرچی لەئەدەبی نووسراودا رۆشنبیری بێگـــانەو کاری‌گەری ئەدەبی بێگانەو رەنگدانەوەی لەئەدەبی کوردیدا دەبینن . لەفۆلکلۆردا زیاتر رەسەنایەتی‌و پارێزگاری ئەو شێوە دەربرینە سادەیە زیاتـــــر دەبینرێ و گەل پارێزگاری رەسەنایەتی کردووە .

لەگەل ئەوەی هەندێ وشەی بێگانەی تێکەل بووە . ئـــەوەی دەمەوێ لەرووی فولکلۆرەوە رووی بکەمەوە ئەوەیە کە ئەم ئەدەبــە سەرزاری‌یەی دەماو دەم‌و سیناو ســـنگ بۆمان ماوەتەوە و گــــەل پارێزگاری مانەوەی کردووە لە وولاتە سۆشیالیستەکانو وولاتـــــە

سەرمایەدارەکان بەجۆرێك تەماشا کراوە بەپێویستی دەزانین ئــەم فولکلۆرە لەو فۆلکلۆرە ناوەرۆکە فراوانەی جیا بکەینەوە کە لــەوولاتە سەرمایەدارەکاندا پەیرەو کراوەو گەلێ لق‌و پەلکی لێ‌بۆتەوە . واتــە فولکلۆر لەو وولاتانەدا هەر تەنها ئەدەبە سەرزاری‌یەکەی نەگرتۆتەوە . بەلکو هەموو روویەکی میللیشی گرتۆتەوە کە تایبەتە بەزانستێکی تــر ئەویش ئەشنۆگرافیایە کە « یاری‌و نەخش‌و نیگار ، قاپ‌و قاچاخ ، کاســەو کەوچك. سازو ئاواز ، کەرەسەی لەبەرکردن‌و خۆرازاندنەوە، خۆراك ، ئامێری دروســت کەرو بەرهەم دەرهێنەر ، تیمارکـــردن ، خانەسازی ، راوو چەك ، کەل‌و پەلی ئاژەڵ ، ئەستێرەوانی‌و کەش » ئەگرێتەوە .

زانستی ئەشنوگرافیاو فولکلۆر لەوولاتــە ســـۆشیالیستەکاندا بەدوو زانست‌و دووبابەتی جۆراو جۆری تایبەت دادەنرێ ، ئـــەم دووبابەتە لای هەندێ کۆکەرە کوردەکان تێکەڵ کراوەو ئەوانە هەمان رێبازیان گرتووە کە لەوولاتە سۆشیالیستەکان پەیرەو کراوە بێ‌ئەوەی ئەم دووبابەتە لەرووی ناوەرۆکەوە جیابکەنەوە . بۆیـــە هـــەر ئـــەم کتێبەی بەناونیشـــانی ( سەرنجێك لەدەروازەی فولکلۆری کوردەوە ) کە لەلایەن نەقابەی مامۆستایانی هەولێر سالی 1960 چاپکراوە ئەم راستی‌یە بەدی دەکەین ..

لەوولاتە عەرەبەکانیشدا هەر هەمان رێبازیان گرتووە لەرووی ناوەرۆکی فولکلۆرەوە .

فۆلکلۆر ناسە کوردەکان دوا بەدوای شەستەکانەوە ئەوەیـــان رەچاو کردووە کە فۆلکلۆر تەنها بەبابەتی سەرزاری دابنرێت . ئــەو بابەتانەش لە وولاتە ســۆشیالیستەکان دوای شۆرشی ئوکتۆبـــەر پەیرەو کراوە .

هەر چونێك بێت ئەم دووبابەتە لەرووی رەســــەنایەتی‌یەوە پارێزگاری بوونی خۆیانی‌و چەشەو شەقلی تایبەتی کردووە . بۆ نموونە بەشێکی دەولەمەندی فۆلکلۆر کە گۆرانی‌یە و بەناو هەموو ناوچەکانی کوردستاندا بلاوبۆتەوە . لەرووی ناوەرۆکەو رووخسارەوە بەهــەموو جۆرەکانی گۆرانی‌یەوە بەپێی قۆناغەکانی مێژووی کورد رۆڵێکی گــرنگی لەپاراستنی رۆشنبیری کوردو رەسەنایەتی بینیوە . ئەو گۆرانیانەی کە نووسراوەو یاخود لەبەرکراوە لەبنەرەتدا لەســەر زار لەبەر کراوەو مرۆڤی کوردیش بەهۆی ئەو لەبەرکردنەوە پارێزگاری کـــردووەو لەبیری خۆیدا چەسپاندوویەتی‌و ئەگەر ناو بەناو دەماو دەم زیاتر بەناو خەلکیـــدا بلاوبوویێتەوە گۆرانیان هەر لە رووخساردا بووە .

ئەگەر ئەم پارێزگاری‌یە بەنیسبەت گۆرانی کوردیەوە بێت. ئەوە بەشەکانی دیکەی فۆلکلۆریش هەر هەمان رەسەنایەتی پیا دەبینرێ و لە دڵ‌و دەروونی پاکی هەستی کوردەوە بەشێوەی سەرزاری دەربان

بڕیووەو بێ ئەوەی جۆری لاسایی کردنەوەی تیا دەرکەوتبێ .

لە رووی دەستنیشان کردنی واتای فۆلکلۆرو ناوەرۆکی فۆلکلۆرەوە زیاتر دەتوانین دەست نیشانی رەسەنایەتی‌و هونەری و جوانکاری لەفۆلکلۆردا بکەین .

کاتێ ووشەی فۆلکلۆری ئینگلیزی شی‌کەینەوە ئەو واتایەمان دەستگیر دەبێ کە زانین یاخود حیکمەت‌و پەندی گەلەکانمان بۆ روون دەبێتەوە . لەزاراوەی فۆلکلۆردا ووشەی گەل بەلگەیە کە گەل فۆلکلۆری دروست کردووە .

هەر لەناو بەشەکانی فۆلکلۆردا پەندو چیرۆك‌و گۆرانی‌و داستان ناوەرۆکێکی فراوان‌و دەولەمەندیان هەیە . ئەویش بریتی‌یە لەبوونی گەل ، گەل لە فۆلکلۆردا رۆلێکی گرنگ ئەبینێ بۆ پێشخستنی بیری پێشکەوتوو .. فۆلکلۆر رووداوی مێژوویی‌و خەبات کردن لەپێناوی رزگاری‌و سەربەخۆیی‌و نیشتمان پەروەری‌و پەروەردەکردنی وەچەی نوێ .دلپاکی‌و وەفایی‌و راستگۆیی‌و عەشق‌و ئەڤین‌و دلسۆزی‌و راستی‌و دۆستایەتی‌و داب‌و نەریتی کۆمەلایەتی‌و میوانداری لەبەشەکانی فۆلکلۆردا رەنگی داوەتەوە .

کەواتە فۆلکلۆر خۆی لەخۆیدا هونەرێکە کەواتایەکی جوانکاری دەگرێتەوە . گرنگی‌و بایەخدان بەفۆلکلۆر لەوەدایە کەواتای پێزانین « ادراك » و بیری پەروەردەو جوانی‌ناسی « ئیستاتیك » وەك زنجیرەیەکی نەپچراو دەولەمەندی‌و فراوانی ناوەرۆکی فۆلکلۆر دەردەخات .

**سروشتی کۆمەلایەتی فۆلکلۆر لە دروست کردن‌و چەسپاندنی واتا دایە .. ئەو جوانکاریی‌یەی کەدەبینرێ ئەوەیە کە گەل دروستی کردووە ، لەسەرروو هەمووانەوە چینی زەحمەت کێش ... ئەم چینە هیوای بەدوا رۆژێکی رووناك هەیە ، روون بینی‌یەك لەژیاندا بەدی دەکات کە لەفۆلکلۆرەکەدا ئەم جوانی‌یە بەدی دەکرێ .**

کەواتە لەناوەرۆکی فۆلکلۆر سروشتی ژیانی گەلی کوردمان بـۆ دەردەکەوێ . ئەو فۆلکلۆرە لەگەل ئەو سروشتەدا دەژی‌و رەنگدانەوەی جۆری بیرکردنەوەی گەلی کوردو باری کۆمەلایەتی ژیانی کوردە . گەل لەرێگای ئەو ئەدەبە سەر زاریی‌یەوە نەوەکانی خۆی یەك لەدوای یەك پەروەردە دەکاو چێژو زەوقی بەرزی گەل دەردەخات . خۆشەویستی گەل بەرامبەر بەم شاکارە گەلی‌یە نیشانەو بەلگەی گرنگ‌دان‌و پارێزگار کردنی‌یەتی .

هەر لەم رووەوە دەتوانین ئەو گرنگی‌و تایبەتیانەی کە لەفولکلوردا دەبینرێ دەستنیشان بکەین : ــ

**١ ــ فۆلکلۆر بەبەرهەمی خولقێنەرانەی گەل دادەنرێ و دەدرێتە پال هەموو میللەت‌و پشتاو پشت‌و دەماو دەم بـۆ یەکتری دەگێڕنەوە و شەقلی تایبەتی ئەو گەلەی تیا دەبینرێ .**

**٢ــ لەبەر ئەوەی دەماو دەم دەوترێ و بۆمان ماوەتەوە دانەرەکەی دیار نی‌یە و کاریی گەلی‌یە .**

**٣ ــ شێوەی دەربڕینی فۆلکلۆر شێوەیەکی سادەو ساکارە .**

٤ ــ فۆلکلۆر توانای مانەوەی لەدێر زەمانەوە هەبوودو هەیەو سەردەمێك ئەم ئەدەبە هەبووە هیچ هونەرێکی دیکەی ئەدەبی نووسراو نەبووە . کەواتە فۆلکلۆر مێژوویەکی دێرینی هەیە .

٥ ــ ئەدەبی فۆلکلۆری چێژێکی بەرزی هەیەو زوربەی هەرە زۆری گەل تێی دەگات . چونکە بەگوێیان ئاشکرایەو بەزمانی ئەوان وتراوە .

٦ ــ لەبەر ئەوەی لەناو جەرگەی گەلەوە هاتوتە دەرەوە بەهونەرێکی واقیعی دادەنرێت .

٧ ــ لەروخساردا فۆلکلۆر دەگۆرێت ئەمەش لە ئەنجامی پشتاو پشت‌و نەوە بەنەوە گەیاندنی . بەلام لەناوەرۆکدا هیچ گۆڕانێك بەدی ناکرێ بەتایبەتی « گۆرانی ــ بەند ــ مەتەل »

بۆ نموونە : ــ

بەرز فرین ملی پیاو دەشکێنێ
بەرز فری بەنەویا کەوت .
ئەوەی بەرز فڕی . تڕی .
بلند فڕیم ، ئالچاخ کەتم .
چقاس بلند فڕی ، ئەو قاس خارو دکەڤی .
هەر کەسێ لەبلند رابمێنێ ، ملی دەشکێ .
ئەوی بەبلندا بڕوانێ ، بەنەویاندا دەکەوێ .

٨ ــ فۆلکلۆر لەسنوورێکی زۆر گەورەدا بلاودەبێتەوە و گەلێ کێشوەریش دەگرێتەوە ، ئەمەش زیاتر پەیوەندی بەپەندو قسەی نەستەق‌و پڕو پوچی پێشینان‌و حیکایەتەوە هەیە ..

زۆر جاریش لەسنووری وولاتەکەی تێپەر ئەکات‌و گەلانی دراوسێش هاوبەشی ئەوبەشە فۆلکلۆرەن بۆنموونە داستانە دلداریەکانی وەك .

شیرین‌و فەرهاد ، شیرین‌و خەسرەو . خەج‌و سیامەند ، شێخی سەنعان . وە لەداستانی قارەمانەتی‌دا وەك « کۆر ئۆملی » .

٩ ــ فۆلکلۆر ئەدەبێکی سەرزاری جیهانی‌یەو هەموو میللەتێك خۆی بەخاوەنی فۆلکلۆر دەزانێ .

١٠ ــ فۆلکلۆر لەبەر ئەوەی لەناوجەرگەی گەلەوە هەلقولاوە هەموو هەست‌و ئارەزووەکانی گەل دەردەخات و بووە بەشەو چەرەی کۆڕی دیوەخان‌و مزگەوت‌و چاخانەکانی چەندەها سال لەمەوبەر .

١١ ــ ئەدەبی فۆلکلۆر لەبەر ئەوەی زۆر بلاوبۆتەوە باشترین کەرەسەیە بۆ لێکۆلینەوەی ژیان و زمان و مێژووی گەل .کوردناسە ئەوروپیەکان لەرێگەی تێکستەکانی فۆلکلۆرەوە توانیویانە ژیان گەلی کوردو بەرزی ئەدەبی سەرزاری کورد دەست نیشان بکەن .

